قادر عەبدوڵا

# کورد لە ڕۆژە سەختەکاندا

## ڕۆڵی کوڕانی بارزانی لە داگیرکردنەوەی ڕۆژهەڵاتی کوردستان

وەرگێڕانی

دلاوەر کەریم





قادر عەبدوڵا

# کورد لە ڕۆژە سەختەکاندا
## ڕۆڵی کوڕانی بارزانی لە داگیرکردنەوەی ڕۆژهەڵاتی کوردستان

وەرگێڕانی
دلاوەر کەریم

## کورتەیەک

کوردستانم نەدەناسی، چووم تا بیناسم کارێک کە پێویست بوو بیکەم، ئەوەبوو یەکسەر بچمە نێو خەڵکەکەوە.

جا ئەوەی کە نووسیومە بەرهەمی ئەو سەردانەمە بۆ نێو خەڵکی کوردستان، هەر ئەوەندە.

**قادر عەبدوڵلا**

## پێشکەشە

ئەم نووسینەم ئەگەر بایەخێکی هەبێت، ئەوا پێشکەشی دەکەم بە:

هاوڕێ کوردە هێژاکانم

ئەو هاوڕێ باشانەی کە هەر لەم ڕۆژانەدا چەند کەسیان بە تۆمەتی (دژی شۆڕش) گوللەباران کراون.

**پێشکەشی دەکەم بە:**

هاوڕێیانی هێژای وەک:

کاک فوئاد (بە بڕیاری دادگای فاشیستی گوللەباران کرا.)

**پێشکەشی دەکەم بە:**

کاک ناجی (لەگەڵ قارەمانانی دیکەی کورد بۆ خەباتی پارتیزانی خۆیان گەیاندە چیاکان.)

**پێشکەشی دەکەم بە:**

کاک محەمەد (لە شنۆ.)

**پێشکەشی دەکەم بە:**

کاک مستەفا (لە گوندی ئەتەمیشی نزیک سابڵاخ.)

لەگەڵ ئەوپەڕی ڕێزی قادر عەبدوڵلا

ئابی ١٩٧٩

## پێشەکی چاپی دووەم

رەنگە لە سەرەتادا خوێنەری ئەم کتێبە، لەو باوەڕدا بێت کە نوسەرێکی ئێرانی، لە سەرەتای هەرەسهێنانی رژێمی پادشایەتی و دروست بوونی جمهوری ئیسلامی، بە ڕێبواری دەچێتە خۆرهەڵاتی کوردستان و چەند یاداشتێکی هاکەزایی تۆمار دەکات و ناوی دەنێت کتێب. ئەم تێڕوانینە هەتا ئەو کاتە کەمێک دروستە کە ئێمەی کورد خۆمان مێژووی خۆمان ئەرشیف کەین و خاوەنی زاکیرەیەکی مێژوویی فیل ئاسا بین، بەڵام کاتێک ئەو کارەمان نەکردووە، دەبێت هەموو ئەو نوسین و ئەرشیفانەی کە بوونەتە مێژوو بۆ ئێمەو بێگانەکان تۆماریان کردووە، بەهەند وەربگرین و بتوانین بەهۆیانەوە دیوە شاراوەکانی مێژووی خۆمان و ڕووداوەکان هەڵسەنگێنین. رەنگە سیاحەت نامەی ئەولیای چەلەبی باشترین نمونە بێت بۆ ئەم وتەیە.

گرفتی هەرە سەرەکی ئێمەی کورد، بیرچوونەوەیە. ئەگەر بەخێرایی ڕۆبچینە ناو لاپەڕەکانی مێژوو، زۆر بەخێرایی هەست بەو دەردە کوشندەیە دەکەین، هەر بە هۆکاری ئەم دەردە کوشندەیەشە ڕووداوەکانی سەد ساڵی لەمەوبەری ئێمەی کورد بریتییە لە دووبارەبوونەوەی بەردەوام. واتە هەر چارەکە سەدەیەک جارێک شتێک دەکەین و بەهەڵەیەکی کوشندە لەناوی دەبەین، دواتر دوای چارەکە سەدەیەکی دیکە دێینەوە هەمان هەلە دەکەینەوەو دووچاری هەمان دەرەنجام دەبینەوە، کەچی بەبێ ئەوەی بوەستین و پرسیار بکەین بزانین علەتەکە چیە، (سیزیف) ئاسا هەمان کار دەکەینەوە و دووچاری هەمان

کارەسات دەبین و ئوباڵەکەشی دەخەینە ئەوستۆی ئەم و ئەو.

لەم کتێبەدا ئەم ڕاستیە زۆر بە جوانی و ئاشکرا دەردەکەویت. نوسەری کتێبەکەش قادر عەبدوڵا وەک ئەوەی بیەوێت پەنجە بخاتە سەر هەمان دەردی کوشندە و ئازارەکانمان بکولێنیتەوە بۆ ئەوەی شوێن و مەودای ئازارەکە بخاتەوە نێو زەینی تاکی کورد، لەم کتێبەیدا ئاماژە بۆ هەمان ڕاستی دەکات و دەیسەلمێنێت..

قیادە مۆقەتە کە لەدوای ئاشبەتاڵەوە، لەو دیو سنورەکانی باشوری کوردستانەوە دروستکرا، ماسکێک بوو بۆ ئەو قۆناغەی پارتی، سەرلەنوێ بنیات نانەوەی ئەو شۆڕشی چەواشەیە بوو، کە ئەرکی خۆی لە ئاشبەتاڵدا بۆ ساواک و میتی تورکی و مۆساد و سی ئای ئەی جێبەجێکردبوو. ئەرکی تازەی پارتی دەبوو لە بەرگ و ماسک و دروشم و ڕەنگێکی تازەی ئەوتۆ بێت کە بتوانێت لەگەڵ ژینگەی تازەی سیاسی ناوچەکەدا بگونجێنرێت. ڕوخانی ڕژێمی شای ئێران، کورد و کوردستانی زیندوو کردەوە، بۆ ئەمەش دەوڵەتانی ناوچەکە دەبوو داردەستێکی بەهێزو چەواشەکاریان هەبێت تا بتوانن دیسانەوە ئاشبەتاڵی پێبکەنەوە و لەناوی بەرن. لەبەر ئەم هۆکارەیە کە دەبینین یەکسەر لەدوای دروست بوونی جمهوری ئیسلامی ئەم تاقمە بەهێزکرانەوەو خرانەوە نێو گۆڕەپانی سیاسی ناوچەکەو وەک داشە هارەی دامە خرانەوە نێو گەمەی سیاسی و لە دژی گەلی کورد لە هەرچوار پارچەی کوردستان خرانەوە گەڕ.

گرمەی خەبات و شۆڕش ئەوێ ڕۆژی لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان بوو، بۆیە قیادە مۆقەتە وەک مۆتەکە بەردرایە گیانی شۆڕشی کوردەکانی ئێران. ئەم ئەرکەش بۆ قیادە زۆر ئاسان بوو، چونکە ئەوان پێشتر ئەم کارەیان زۆر بە جوانی بۆ ساواکی ئێران ئەنجام دابوو.

سەرەتای خیانەتی پارتی و مەلا مستەفا لە کوردانی ئێران، دەگەڕێتەوە بۆ شەستەکانی سەدەی رابووردوو، لە نێوان سالانی ۱۹٦۲-۱۹٦۸ زۆرترین سەرکردەو کادێرانی دیموکرات بە دەستی شەخسی بارزانی گیران و کوژران و تەسلیم بە ساواک کرانەوە. ئێستاش مێژوو مەفرەزەکانی سەعید مەسیفی و عەبدول وەهاب ئەتروشی، محەمەد هەرسین (سالی ۱۹۷۹ بەدەستی پارتی خۆی کوژرا) لەبیر ناکات کە ئەندازیاری دڵسۆزی ساواک بوون بۆ کوشتنی سەرکردەکانی دیموکرات.
مەلا مستەفا تەنها بە گرتن و کوشتن و تەسلیم کردنەوەی ئەندامان و سەرکردەکانی دیموکرات، خزمەتەکانی خۆی پێشکەش نەدەکرد بە ساواک، بەڵکو لەتوپەتکردنی حزبەکە و کڕینی هەندێک لە ئەندامەکانی بۆ ساواک بەشێکی دیکەی کارەکانی مەلا مستەفا بوو، هەروەک چۆن دواتر لەگەڵ کوردەکانی تورکیا کردی و دواتریش کوڕو کوڕەزاکانی لەگەڵ حزبەکانی باشوری کوردستان و سوریاش کردیان.
ئەوێ رۆژی عەبدول رەحمانی قاسملو سەرکردەیەکی گەنج و هەڵسوڕاوی دیموکرات بوو، کە لە ژێر کاریگەری بیری چەپ وماویزمدا بوو. ئەمەش بێگومان تەنها بۆ ئێرانی شاهنشاهی هەڕەشە نەبوو، بەڵکو بە تورکیا و ئیسرائیل و ئەمەریکاش هەزم نەدەکرا. بۆ ئەم ئەرکە مەلا مستەفا راسپێردرا کە ئەو رەوتە لەناو بەرێت. مەلا بە گوێرەی ئەو نەخشە وپیلانەی کە فەرمانی پێکرابوو، کاری کرد. باڵێکی سیاسی لەناو ئەو حزبە بە رابەرایەتی ئەحمەد تۆفیق قوت کردەوە.
بارزانی لە سالی ۱۹٦۳ لە کۆنگرەی حزبی دیموکرات لە سوننێ لە ناوچەی پشدەر رێگای بە هیچ لایەنگرێکی قاسملو نەدا بچێتە ناو کۆنگرە و خۆیان بردیان بەڕێوە. هەر لەو کۆنگرەیەش قاسملو وەکو خیانەتکار لەقەڵەم درا. ئیتر حزبی

دیموکرات لەو کاتەوە کەوتە دەستی بارزانی و ساواکیش بە ئارەزووی خۆی توانی زەبر لە ئەندامانی حزب بدات و سەکردەی وەک سلێمان موعینی (راستەوخۆ بە فەرمانی مەلا مستەفا کوژراو تەرمەکەی درایەوە بە ساواکی ئێران) و مەلا ئاوارە بکوژێت. بۆیە لەسالی ١٩٦٦ بالەکەی قاسملو لە دۆلی ئالانێ کۆمیتەیەکیان دروست کرد بەناوی (کۆمیتەی ئینقلابی حزبی دیموکرات) کە پێکهاتبوو لە حەوت کەس (حەمەد ئەمینی سیراجی، سمایلی شەریفزاد، سالار حەیدەری، مەلا ئەحمەدی شەلماشی –مەلا ئاوارە- سەعید کوێستانی، سەنناری مامەدی، مەلا عەبدولای عەبدولاهی) دروستکردنی ئەو کۆمیتەیە مەلامستەفاو ساواکی تورە کرد، بۆیە پێکەوە کەوتنە راودوونانی ئەندامەکانی. دوای ئەوەی کە چەند کەسێک لەو کۆمیتەیە بە دەستی پاراستن و ساواک دەگیرێن و دەکوژرێن، ئینجا ساواک داوای ئەحمەد تۆفیقیش دەکات، بەلام بارازانی ئەو رەوانەی کانی ماسی دەکات و دووری دەخاتەوە دواتر بەبێ ئەوەی کەس بزانێت ئەم پیاوە چی لێهات شوین بزر دەبێت و هەتا ئەمرۆش نە تەرمی دیارە و نە خەبەری هەیە.

قیادە مۆقەتە لە دیوی ئەودیو لە دوای ئاشبەتال بوونە جاشی کۆماری ئیسلامی و ئەوسا لە لایەن خەلک و لەلایەن حزبە کوردستانیەکانی ئێرانەوە بە پاسدار قیادە ناویان دەبرا. تەنها لەشەری ناوچەی مەریوان چەندین شوین بۆ سوپای پاسداران دەگرنەوە و ١٥ پێشمەرگەی دیموکراتیش کە بەدیل گیرابوون رەمی دەکەن. لەشەری سێ مانگەدا کە سوپای ئێران هێرشی کردە سەر رۆژهەلاتی کوردستان بەشێکی گرنگی شەرەکان پاسدار قیادە واتە قیادەی مۆقەتەو کورانی بارزانی دەیانکرد، هەتا ئەمرۆشی لەسەربێت ٦٠٠ کەسی قیادە مۆقەتە واتا جاش.پاسدار کە ئەندامی پارتی بوون، موچەی شەهیدانە لە

سوپای پاسداران وەردەگرن. ساڵی ١٩٨١ بۆ ئەوەی پاساوی جاشایەتی خۆیان بۆ کۆماری ئیسلامی و سوپای پاسداران بۆ ئەڵقەلەگوێکانی خۆیان بێننەوە، شانۆگەرییەکیان بە ناوی دزینی تەرمەکەی مەلا مستەفا ساز کرد. بەهۆی ئەوەی کە گوایا حزبی دیموکرات ئەم کارەی کردووە، پاسدار قیادەو سوپای پاسداران هێرشیان کردە سەر ناوچە ئازادکراوەکان و لە ئاکامدا ناوچەکانی شنۆ و مەرگەوەر لە دەستی دیموکرات دەردێنن و دەیدەنەوە بە سوپای پاسداران.

لە کۆنگرەی هەشتی حزبی دیموکرات مەسعود بارزانی لە دژی قاسملو پشتگیری حەسەن رەستگارو حسێن مەدەنی و جەلیل گادانی و ژمارەیەکی دیکەی سەرکردەکان دەکات. دواتریش ئەمانە حزبەکە دەکەن بە دوو کەرتەوەو لە قاسملۆ جیا دەبنەوە. بێگومان دواتر دەرکەوت کە ئەم کارە لە بنەڕەتا نەخشەی ئیتلاعاتی ئێرانی بووە کە پارتی ئەندازیاری داڕشتن و جێبەجێکردنی بووەو حسێن مەدەنی لە بەرامبەردا پارەیەکی زۆری وەرگرتووە. هەتا ئەمڕۆشی لەسەر بێت قیادەمۆقەتەی دوێنێ و پارتی دیموکراتی ئەمڕۆ، بەردەوامن لەسەر شۆڕشی چەواشەو بە هەرچوارلادا خزمەتی ئیتلاعات و میتی تورکی و مۆساد و سی ئای ئەی دەکەن. نمونەی ئەوەش زۆرن بەلام دروستکردنی ئەنەکەسە لە دژی کوردەکانی سوریا باشترین و تازەترین نمونەی ئەو کارانەن.

ئەمەیە مێژووی قیادە مۆقەتەو کوڕانی بارزانی، بەلام وەک لە سەرەتادا باسمان کرد، ئێمەی کورد خوێندەوایمان لە مێژوودا نیە، زاکیرەمان کزو لاوازە، دەنا چۆن دوای ئەو هەموو جینایەت و کۆمکوژیە لە دژی گەلی کورد، کوردانی ئێران متمانە بە بنەماڵەی بارزانی دەکەن؟ ئەو رۆژەی کە لە باشور ریفراندەم کرا، لە رۆژهەلاتی کوردستان زۆر دڵپاکانە خۆپشاندان کرا و

خەڵکەکە هاواریان دەکرد (پیرۆزە پیرۆزە سەربەخۆیی پیرۆزە). ئەم دیمەنە هێندە کارەساتبار دەهاتە بەرچاو، کە بەڕاستی مرۆڤ بەزەیی بە کوردی خۆش باوەڕو داماودا دەهاتەوە کە باوەڕ بە کوڕانی بارزانی بکات دەوڵەتیان بۆ دروست دەکات.

ئەم کتێبە چەردەیەک لە تاوانەکانی قیادەی مۆقەتەو کوڕانی بارزانی لە دژی کوردی رۆژهەڵات دەخاتە ڕوو. نوسەری ئەم کتێبە نەهاتووە تەنها سەرد (گێڕانەوە) بکات، بەڵکو بەهۆی سەلیقەی ئەدەبی و ویژەیی خۆی توانیویەتی جگە لە تۆمارکردنی یاداشت و روداوەکان، ئیستاتیکایەکی قەشەنگ و ناسکی ئەدەبی پێشکەش بکات کە مرۆڤ لە چەندین جێگادا بە ئاشکرا هەستی پێدەکات.

ئەم کتێبە لە ئابی ۱۹۷۹ نوسراوە. نوسەری کتێبەکە وەک رۆژنامەنوس یاخود روناکبیرێکی ئێرانی رۆژگارە سەختەکانی ئەو سەردەمە تۆمار دەکات و ناوی دەنێت (کورد چی دەوێت)، بەڵام ئێمە پێمان باش بوو ئەو ناونیشانە بگۆڕین بۆ ئەوەی خوێنەر لە ناونیشانەکەوە کتێبەکە بناسێت. نزیکەی چل ساڵ بەسەر نوسینیدا دەرباز دەبێت، بەڵام هێشتا زۆر بەنرخ و ناوازەیە بۆ ئیمەی کورد، چونکە قیادە مۆقەتە ئێستاش لەناو هەمان چوارچێوەی کارەکانی خۆیدایەو بەهەر چوار لای کوردستاندا بە گوێرەی نەخشەی دوژمنەکانی گەلی کورد بەناوی کوردایەتی و دەوڵەتی کوردی کار بۆ لەناو بردنی کورد و کیانی کوردی دەکات. هیوادارین بەم کارە توانیبێتمان چەردەیەک لە مێژووی رەشی قیادە مۆقەتە وەبیربێنینەوە!

دلاوەر کەریم

# چوون بۆ مەریوان

سەیرم کرد باشترین ڕێگا بۆ ناسینی کوردستان ئەوەیە، بچم و لە نزیکەوە ئەوێ ببینم، بۆیە جانتاکەمم هەڵگرت و وەڕێ کەوتم. سەرەتا نەمدەزانی لە کوێوە دەست پێ بکەم، بۆیە کەوتمە دوای ڕووداوەکان، ڕەنگ بێت ئەمە ڕێگەیەکی دروست نەبێت بۆ ناسینی کوردستان، بەڵام لەمە زیاتر کارێکی دیکەم لە دەست نەدەهات.

دوێنی شەڕ و تێکهەڵچوون لە مەریوان ڕوویداوە، ڕادیۆ دەڵێ: مەریوانییەکان سێزدە پاسداریان کوشتوون، دەڵێ: پاسدارەکانی ئێمە شەربەتی شەهادەتیان نۆشی، دەڵێ: بێلاموجیم دەچنە بەهەشت و لە ڕۆژ حەوزی کەوسەر لێویان تەڕ دەکەن، کەوابوو منیش دەچمە مەریوان، ئاخر لەوێ هەر چۆنێک بێت هەواڵ و باسێک هەیە.

هەر ئەمڕۆکە گەیشتمە سنە، زۆر دەستپاچە و شڵەژاوم، هەر چاوەڕوانی شتێکی نائاسایی دەکەم، کاتێک ئەوە نابینم ڕۆدەچمە نێو خەیالان:

"کە دەگەیتە سنە و دەشچیتە چاخانەیەک، هەر لەگەڵ ئەوەی قامەت و سەروسیمای ژن و پیاوانی کورد دەبینی، بە خۆت دەڵێی ئەم گەلی کوردە ئۆتۆنۆمی، ئازادی یان هەر شتێکی دیکەی بیەوێت بەدەستی دێنێت.

هەڵبەت ئاشکرایە، ئەم قسەیەم زیادەڕەوییە، چونکە بە چوونە چاخانەیەک و بینینی کەسانێک بە جلوبەرگی کوردییەوە ناکرێ یەکسەر بڵێی و بگەیتە ئەو دەرەنجامەی کە بەڵێ ئەمانە هەرچییەکیان بووێت بەدەستی دێنن، کاتێک زیاتر دەچیتە پێشەوە و وردەوردە- لەگەڵ مێژووی خەباتی گەلی کورددا ئاشنا دەبیت، تێبینی دەکەیت، چەند شاش بوویت و پاشان پەی بە هەڵەی خۆت دەبەیت.

کاتژمێر سێی دوانیوەڕۆیە، ڕادیۆ هەواڵەکان پەخش دەکات، خەڵکەکە دەستە دەستە لە دەوری ڕادیۆکە کۆبوونەتەوە:

**لە مەریوان رەوش نائارامە:**

چیدی ڕاناوەستم، خۆم دەگەیەنمە گەراجەکە و بە ئوتوبوسێک کە ئامادەیە و تا دەگرێت خەڵکی سوار کردووە و گەرماش هەناسەت دەگرێت بەرەو مەریوان دەکەومە ڕێ.

لەسەر نەخشەدا مەودای نێوان مەریوان و سنە شتێکی ئەوتۆ نییە، وادەزانی لانی زۆر سەعات و نیوێک ڕێگەیە، بەڵام کە سواری ئوتوبوس دەبیت و دەکەویە ڕێ، بەنێو تۆز و خۆڵدا دنیایەک پێچ و گەوە و هەوراز و نشێو تەی دەکەیت، سەیر دەکەیت وا پێنج کاتژمێرە بە ڕێگاوەیت، کەچی هێشتا نەگەیشتوویت. نزیک مەریوانین کە ئوتوبوسەکە لە کار دەکەوێ و تەکان ناخوات. سەرنشینەکان لەنێو ئەو گەرمایەدا لە ئوتومبێلەکە دادەبەزن و بە ناچاری لەو بەرهەتاوە تخێڵ دەبن، سەروگوێلاکی هەموومان تۆزاوییە. پیکابێک دەگاتە ئەوێ و لەگەڵ یەک دوانێکیان سواری پیکابەکە دەبین و بەرەو شار دەڕۆین، شۆفێرەکە کوردە، بە کوردی دەدوێن، من لێیان تێناگەم، بەڵام پێدەچێت شەڕ و تێکهەڵچوونەکە تەواو بووبێت. لەپڕێکدا شۆفێرەکە تێبینی ئەوە دەکات کە بیانیم و لە قسەکانیان

ناگەم، بە فارسییەکی شڕووڕ دەڵێ:
"تێدەگەی؟ شەڕی نێوان جووتیار و خومەینییە. کۆمیتەییەکان[1] لەگەڵ ئاغاکان دەیانەوێت بمانکوژن."
پاشان دەنگی خۆی زیاتر هەڵدێنێ: "ئێمە خومەینیمان ناوێت، ئۆتۆنۆمیمان دەوێت."
پیکابەکە بە خێرایی لە شار نزیک دەبێتەوە. کە دەگەیتە شار و خوڵێک لێدەدەیت، هەرزوو تێدەگەیت، هەواڵگەلێک هەن. لاوان بەو تفەنگانەی بە شانیانەوەیە، بەو سوونگی و نارنجۆک و ڕەخت و فیشەکانەی بە خۆیانە کردوون، دێن و دەچن و دیدەوانی دەگرن، بەڵام جگە لەو گەنجە چەکدارانە کە بۆ کەسێکی بیانی نائاسایی دەکەونە بەرچاو، ئیدی هەموو شتێک ئاسایی و ئارامە. ژنان بە جلوبەرگی کوردییەوە لەنێو شاردا بەدی دەکرێن. ژمارەیەکی کەم ئۆتومبێلی تایبەت لەشەقامەکاندا دیارن، زیاتر پیکابی بارهەڵگر بەرچاو دەکەون کە لە دێهاتەکان خەڵکی سوار دەکەن و دەیانگەیەننە شار.
لە بەردەم دوکانێکی بچوکدا کۆمەڵێک منداڵ ڕیزیان بەستووە و هەر یەکە و کارتۆنێکی بە دەستەوەیە، پیرەمێردێکیش لە پشت دەزگایەکی کارەبایی دانیشتووە و پەشمەک دروست دەکات. منداڵەکان لەبەر بێکاری خەریکی پەشمەک فرۆشتنن. یەکێک لە منداڵە پەشمەکفرۆشەکان خەریکی خوێندنەوەی بڵاوکراوەی ڕووداوەکانی مەریوانە بۆ کابرای خاوەن دوکان. منداڵەکان هەر دانەیەک پەشمەک بە ڕیاڵێک دەکڕن و جووتی بە پێنج ڕیالیش دەیفرۆشنەوە، بەڵام بەر

[1]-(کۆمیتەکانی شۆڕشی ئیسلامی) یەکەمین ڕێکخراوێک بوون کە دوای شۆڕشی ئێران دامەزران و دواتر دژی نەیارەکانی خومەینی، تاوانی زۆریان ئەنجام دا بەتایبەت دژی خەڵکی کوردستان.

لەوەی هەمووی بفرۆشن بەشێکیان تێکدەچن یان لەبەر تیشکی گەرمی خۆردا دەتوێنەوە.

پیرەمێردەکان لە پای دیوارەکاندا وەستاون. ئەگەر کەسێکی بیانی بهێتە ئەوێ، هەر زوو لە شاردا دەناسرێت و دەکەوێتە ژێر چاودێری، بۆیە چەند کەسێکی چەکدار دەورم دەگرن:

**"ڕۆژنامەنووسیت؟"**

هەموویان گەنجن، ڕەنگە خوێندکاری ئامادەیی بن، زۆر دۆستانە ڕەفتار دەکەن.

"نا، ڕۆژنامەنووس نیم، گەڕیدەم، بۆ خۆم دەنووسم."

"باشە، بابچینە بارەگا، هەموو گەنجە ڕۆنشنبیرەکانی ئێمە لەوێن، یارمەتیت دەدەن"

بارەگا ئیدی لە کوێیە، نازانم، بەڵام دواتر تێدەگەم بارەگا هەمان ئەنجوومەنی ناوچەیی خەڵکی شاری مەریوانە، هەمان ئەو ئەنجوومەنەی کە خەڵکی شار وەک چاوی خۆیان خۆشیان دەوێت، بەڵام دەوڵەت ڕازی نییە. بارەگا ناوەندی چالاکی و فەرماندەیی شاری مەریوانە. بەرەو بارەگای فەرماندەیی دەکەوینە ڕێ. لەبەر دەرگا و پەنجەراندا ژنان و منداڵان دانیشتوون و وەک بڵێی هەموویان چاوەڕێی کەسێک بکەن تا سەبارەت بە ڕەوشی مەریوان ڕاستییەکانی پێبڵێن و ئەویش ئەو ڕاستییانە بۆ کەسانی دی بگوازێتەوە.

"کاکە ڕادیۆ درۆ دەکات".

"دەزانم"

"کاکە ئێمە هەموومان پێکەوەین، ئێمە تەنیا دەڵێین خۆمان دەمانەوێت شاری خۆمان بەڕێوەبەرین، پاسداری لایدە مەنێرن، گوێمان نادەنێ، دەیانەوێت هەلومەرجێک دروستبکەن کە شەڕ هەڵبگیرسێت، دەیانەوێت بیانووێک بدۆزنەوە و بەسەر شاردا بدەن و لەتوپەتمان بکەن و چەکمان لێ بسەنن."

"بەڵێ دەزانم."
دەگەینە بارەگاکە، بارەگا شوێنێکە وەک بینای خوێندنگەیەک بێت، یان ڕەنگە پێشان هۆڵی ڕاهێنان بووبێت. حەوشەی بارەگاکە پڕە لە پیاوانی چەکدار، هەموویان چوست و ئامادەن. ئەو پێشمەرگە گەنجەی ڕێنوێنیم دەکات، پێمدەڵێ:
"ئەمانە ئەو پێشمەرگانەن کە لە سەرتاسەری کوردستانەوە هاتوون. زۆربەیان کوڕە جووتیارن، پێشمەرگەی یەکێتیە جووتیارییەکان، خوێندکاران و خاوەن بڕوانەمەشیان لەگەڵە، لە کوردستان لە هەر جێگایەک شەڕ و دەرگیری ڕوودات، لە یەکێتیە جووتیارییەکان، لە کەسانی سەر بە ڕێکخراوی زەحمەتکێشانی شۆڕشگێڕی کوردستان-کۆمەڵەی زەحمەتکێشان- لە لایەنگرانی ڕێکخراوی (چریکە فیداییەکان)[1]ەوە پێشمەرگە دەنێردرێن و شان بە شانی خەڵکەکە ڕووبەڕووی دوژمن دەبنەوە."
وردەوردە خەریکە هەندێک شتم بۆ ڕوون دەبێتەوە، بەڵام سەر لەو ڕێکخراوانەی ناویان دەبا دەرناکەم، گرنگ نییە دواتر هەر بۆ خۆی تێیاندەگەم. ڕێوانەکە دەمباتە نووسینگەی ئەنجوومەن. بە پێشمەرگەیەکی باڵابەرزم دەناسێنێت، کە باڵای بە چەک و فیشەکدان و نارنجۆک داپۆشراوە.[2]

---

١-ڕێکخراوی (چریکهای فدائی خلق ئیران- پارتیزانە گیانفیداکانی گەلی ئێران، بەڵام ئێمە هەر بە چریکە فیداییەکانی گەلی ئێران ناویان دەهێنین.
٢-ئەم پێشمەرگە کوردە کاک فوئادە، کە دواتر بە فەرمانی دادگای فاشیستی گوللەباران کرا. پەراوێزی نووسەر.
(نازانم ئەگەر مەبەستی نووسەر کاک فوئادی مستەفا سوڵتانی بێت لە شەڕێکی نابەرابەرانە لەگەڵ سوپا و پاسدارەکانی کۆماری ئیسلامی لە نێوان بانە و مەریوان شەهید کرا، جگە لە کاک فوئاد چوار برای دیکەشی بەناوەکانی(حوسێن، ئەمین، ماجد و ئەمجەد) هەر لە لایەن ڕژێمی مرۆڤکوژی کۆماری ئیسلامییەوە شەهید کراون).

لەو هەمو ڕێزگرتن و خۆشەویستیەی ئەو خەڵکە خەباتگێڕە کە لە ئاستمدا دەینوێنن بەسەر خۆمدا دەشکێمەوە، چونکە دەبینم، من بایی ئەو هەموو سۆز و میهرەبانییەی ئەوان نایەم، بەتایبەت کە نازانم دەبێ چی لەو گەنجانە بپرسم، یان دەبێ لە کوێوە دەست پێ بکەم. پیاوە باڵابەرزەکە دەستم دەگوشێ و بەخێرهاتنم دەکات، ئینجا بێدەنگییەک وەک مۆتەکە دەکەوێتە نێوانمان. دەبوا قسەیەک بکەم و ئەو بێدەنگییە بشکێنم، قسەیەک بکەم، یان شتێک بپرسم و ڕوونکردنەوەیەک بدەم، یان بڵێم لەو هەلومەرج و بگرە و بەردەیە بۆچی هاتوومەتە ئێرە، بۆیە بێدەنگی هیچ سوودێکی نییە و دەپرسم: "کاکە، بە ڕاستی پێم بڵێ لێرە چ باسە، چی دەگوزەرێ، دەکرێ پێم بڵێی؟" بە هەرحاڵ ئەو بۆم ڕوون دەکاتەوە، هەندێ لە قسەکانی لای خۆم دەنووسمەوە، بەڵام ئەوەم هەموو دەمی لەبیرە کە بۆچی هاتوومەتە ئێرە، هاتووم شتێک هەڵکرێنم، هاتووم سەرەدەری لەوەی لە دەوروبەرمدا دەگوزەرێ دەربکەم، واتە ئەوەی ئەم پیاوە یان هەر کەسێکی دیکە بۆم باس دەکات و بۆم ڕوون دەکاتەوە، بە هەموو هەست و نەستمەوە گوێی دەدەمێ، تەنیا بۆ ئەوەی شتێک تێبگەم، تەنیا هەر ئەوەندە، قەت چاوەڕوانییێکی دیکەم نەبووە. ئەو پیاوە بۆم باس دەکات:

"دەرەبەگەکان خاوەن دەسەڵاتی سیاسی- کۆمەڵایەتی بوون، خەباتی دژی ڕژێمی شا هیچ کات جیاواز نەبووە لە تێکۆشان دژی دەرەبەگە خۆجێییەکان."

ئەها کەواتە ئەمانە وەک چۆن دژی شا شەڕیان کردووە بیریان لە ڕیشەکێشکردنی فیۆدالیزمیش کردۆتەوە. دەی، دواتر.

"ئاشکرایە کە کۆنەپەرستە خۆجێییەکان و دەرەبەگەکان تا ئەو ڕۆژەی شۆڕش سەری هەڵدا لایەنگری شا بوون، کاتێک شا

ڕۆیشت پشتیوانیان لە بەختیار[1] کرد، بەڵام هەر کە شۆڕش سەرکەوت ئەوان پێگەی خۆیان لەدەست دا، کەوتنەخۆ و بە دوای پشتیوانێکی دیکە، داکۆکیکارێکی دیکەدا گەڕان و ئەو پشتیوانە خۆی لە خۆیدا ئیمپریالیزم بوو، بەڵام خۆ دەبێ لە ڕێی مۆرە و نۆکەرەکانی خۆیەوە بە هانای دەرەبەگەکانەوە بچێت، کاتێکیش نوکەری ئیمپریالیزم، واتە شای ئێران لەنێوچووە، بەختیاریش ڕایکردووە، چیی دەکەن، دەبێ هەرچی زووترە ئەو مۆرەیە بدۆزنەوە، دەبێ دوای شا ئەو هاودەستە تازەیە خۆی بناسێنێت، بە لەبەرچاوگرتنی ڕەوشی نوێ و دەوڵەتی تازە و حکومەتی ناوندی، ئەوان توانیان ئەو هاودەستە و پەناگەیەی خۆیان لە بەرەی "ڕەهبەر"[2]یدا بدۆزنەوە، چونکە ئەو هاودەستە لە لایەن ئیمریالیزمەوە دیاری کراوە و پێشتر بڕیاری لێ دراوە.

دەرەبەگە کۆنەپەرستەکان جاران بە هاودەستی و پشتیوانیی شا، جووتیارانیان دەچەوساندەوە، دوای شا هاودەستی تازەیان لە کەسانی نێو دەوڵەت و "کۆمیتە"کاندا دۆزیەوە، ئەمانە دوای ڕۆیشتنی شا بوونە موسڵمان و داکۆکیکاری پلەیەکی شۆڕشی ئیسلامی.

دەوڵەتیش دەستی ئەو تازە موسڵمانبووانەی گوشی و چەکداری کردن. بەم شێوەیە دەرەبەگەکان دووبارە کەڵکەڵەی گرتنەوەدەستی دەسەڵات و چەوساندنەوەی جووتیارانیان کەوتەوە سەر، بەڵام جووتیاران ئەمجارە زۆر زوو کەوتنەخۆ و لە هەمبەر هاوبەندیی دەرەبەگەکاندا بۆ خۆیان کەوتنە پێکهێنانی

---

١-شاپوور بەختیار ١٩١٤-١٩٩١دوایین سەرۆکوەزری رژێمی محەمەدرەزا شا.

[2]-بەرەی رەهبەری مەبەست خەتی خومەینییە کە لە ئێران پێیان دەگوت (خەتی ئیمام).

ئەنجوومەن و یەکێتییە پیشەییەکانی خۆیان و خۆیان چەکدار کرد و باشتر خۆیان ڕێکخستەوە و بەمەش وەڵامێکی توندی دەرەبەگەکانیان دایەوە و نیشانیان دا کە بە ڕاستی دەسەڵاتی دەرەبەگایەتی لە ڕووی مێژووییەوە تەواو بووە، لە ڕووی سیاسیشەوە وەتاق کەوتووە و دەسەڵاتەکەی دەسەڵاتێکی پووشاڵی و بێ ناوەرۆکە...»

«شەڕی ئەم دواییەی مەریوانیش شەڕی نێوان دەرەبەگ و پاسدارەکان لە لایەک و جووتیاران لەلایەکی دیکە بوو.»

«...بە سەرنجدان لە شۆڕشی گەلانی ئێران و ئەرک و ئامانجە هەنووکەییەکانی ئێران، ڕێک ئێمە لە قۆناغێک داین کە دەبێ ئەمجارە بە هێزی جوتیاران، دەرەبەگایەتی لە ناوچەکە ڕیشەکێش بکەین، بەڵام دەزانین ئەمە ئەرکێکی ئاسان نییە و دەبێ بەسەر زۆر گیروگرفت و ئاستەنگدا زاڵ بین، دەزانین کە شکەست و سەرکەوتن هەردووکیان چاوەڕوانکراون، ئەوەی کە ئێستا لە کوردستاندا جێی باسە و کاری لە سەر دەکرێت، خەباتی لێبڕاوانە و چارەنووسسازی نێوان جووتیارانی چاوکراوە لە لایەک و پاشماوەکانی دەرەبەگایەتی ڕووەولەناوچوون لەلایەکی دیکەیە. ئەمە بۆ دەرەبەگایەتی بە دوایین نەبەرد دادەندرێت کەوا ئێستا ڕووبەڕووی بۆتەوە و ئیدی هیچ پشتیوانێکی دەرەکی ناتوانێت دەربازی بکات.

بە کردەوە سەلمێندراوە کە لەم ٣٠-٤٠ ساڵەی دواییدا ئیمپریالیزم بە بێ دەرەبەگایەتی نەیتوانیوە لانیکەم لە کوردستاندا هەژموونی هەبێ و دەرەبەگایەتیش بە بێ ئیمپریالیزم ناتوانێت باڵادەستی خۆی بەسەر جووتیاراندا بپارێزێت، بەڵام ئێمە دیسان ئەو ئەزموونەمان لە مەریوان بە چاوی خۆمان بینییەوە، ئەمانە دوای ئەوەی هەموو پیلان و کەشوکوش و جموجۆڵ و کردەوە دژە شۆڕشییەکانیان لە

سەردەستی وەرزێرانی دێهاتەکان شکەستی خوارد، بڕیاریان دا لە چوارچێوەی سوپای پاسداران و هێزە ڕەفتار فاشییەکانی وەک ڕێکخراوی (موجاهیدینی شۆڕشی ئیسلامی و هێزگەلی دیکەدا لە مەریوان یان هەر ناوچەیەکی دیکەی کوردستاندا دەسەڵات بگرنەوە دەست و بە گژ گەلی کورد و گەلانی دیکەی ناوچەکەدا بچنەوە، بەڵام ئەمجارە هێزە پێشکەوتنخوازەکان شان بە شانی جووتیارانی هۆشیار دژیان ڕاوەستان و بڕیاریان داوە کە چیدیکە دەرفەت بە دەرەبەگایەتی نەدەن و لەنێویان ببەن. ئەوەی لە مەریوان یان بە شێوەیەکی گشتی لە کوردستان ڕوودەدا هەموو لە چوارچێوەی ئەو بنەمایە دایە..."

قسەکانی بەردەوامن و ڕوونکردنەوەی زیاتر دەدات. منیش بە وردی گوێی لێ دەگرم. پاشان کە قسەکانی تەواو دەبن، وەک بڵێی چاوەڕێ بێ پرسیاری لێ بکەم، بەڵام من هیچ پرسیارێکم نییە، ڕەنگە تیبینی ئەو پەشۆکاوییەی منی کردبێت، یان ڕەنگبێت.. نازانم. بە هەرحاڵ ئاماژە بۆ دەرەوەی پەنجەرەکە دەکات و دەڵێت:

هاوڕێیان لە دەرەوەن، بڕۆ لەگەڵ هەر کامیان دەتەوێت قسە بکە، ئەوان دەتوانن یارمەتیت بدەن."

بەو چاکەیەی لەگەڵمدا دەیکات یەکسەر هەڵدەستم و دەچمە حەوشەکە. نازانم چی بکەم و قسە لەگەڵ کێدا بکەم، بەڵام ئەوە فێر بوومە و دەزانم کە کەمێک سەبرگرتن و هێوربوونەوە هەموو شتێک چارەسەر دەکات. بۆیە هەنگاو هەڵدێنم، دڵنیام هەموو هەنگاوێکم لەژێر چاودێریی کونجکۆڵانەی پێشمەرگەکان دایە. جاری یەکەم کە ناوی پێشمەرگەم بیست، ڕاچڵەکیم و لە دڵی خۆمدا گوتم کەواتە ئەو پێشمەرگە پێشمەرگە گوتنە ئەمانەن، ئایا ئەمانە هەمان ئەو پارتیزانە گیانفیدایانەی کوردن کە لە پێناو خۆبەڕێوەبردنی کوردستان تا دوایین تنۆکی

خوێنیان شەڕ دەکەن؟ بینینی ئەوان بۆ کەسێکی بیانی، یەکەم جار تێکەڵە لەگەڵ ڕێز و وروژان، بەڵام ماوەیەک کە لە کوردستاندا مایەوە و لە نزیکەوە لەگەڵ خەڵکەکەدا ئاشنا بوو دەبینێ، لەو ناوچەیەدا بوون بە پێشمەرگە و پێشمەرگایەتی شتێکی ئاساییە و هەر خێزانێکی کورد بگری لە پێناو بەدەستهێنانی ئازادیدا، زۆر بە ئاسانی ئامادەیە ڕۆڵەی خۆی ڕەوانەی ڕیزەکانی پێشمەرگایەتی بکات.

بە هەرحاڵ لە نێو پێشمەرگەکاندا هەنگاوم هەڵێنان و یەکێکیانم نیشان کرد و لێی چوومە پێش:

"ببوورە کاکە، تۆ کە پێشمەرگەیت، چیت دەوێت کە ئاوا چەکت بە شان داداوە و ئامادەی ڕووبەڕووی دوژمن ببیتەوە؟"

ناوی ئەحمەدە، تەمەنی بیستوپێنج ساڵە، کوڕە جووتیارە و خەڵکی بندۆڵی هەورامانە، دەڵێت:

"ئێمە دەمانەوێت بژین، وەکو ئێوەی فارس. ئاغامان ناوێت، بە کورتی هەر داخوازییەکی ئەوانی دیکە هەیان بێت منیش ئەوەم دەوێت. بڕۆ لە گەنجە خوێندەوارەکانی ئێمە بپرسە، بزانە چییان دەوێت منیش هەر ئەوەم دەوێت."

کەواتە دەبێ لە دەرفەتی گونجاودا بچم لە گەنجە خوێندەوارەکانیان بپرسم تاکو بزانم ئەمانە چییان دەوێت، ئێستا لە دەورم کۆبوونەتەوە. لەگەڵ ئەوەی تەنیشت خۆمدا قسە دەکەم. ئەو پێشمەرگەیە ئاسنگەرە، ناونیشانەکەی خۆیشم پێ دەڵێت و بە دەنگی دلێرەوە دەڵێت:

"بنووسە... ئاسنگەر، شەقامی بۆلوار، تەمەن ٥٦ ساڵ، لە دایکبووی ١٩٢٦، بنووسە کورد یەکەم شت ساختەکاری ناوێت، دوژمنی کەسیش نییە، تەنیا مافی خۆی دەوێت. ئێمە دژی ئاغا و

دەرەبەگین، دژی (قیادەی موەقەتە[1])ین. قیادەی موەقەتە لە لایەن خومەینییەوە قووت کراوەتەوە. داروودەستەی بارزانی، ئەوانەی کە لە (عەزیمیە)[2]ی کەرەج لە نێو ڤێللا خۆشەکاندا دەژین، بە فەرمانی خومەینی، بە فەرمانی بازرگان[3] هاتوون و بەربوونەتە گیانی ئێمە و ژیانیان لێ تاڵ کردووین. بنووسە ئەو قیادە موەقەتانەی کە بە فەرمانی دەوڵەت بۆ سەرکوتکردنی ئێمە هاتوون دژی گەلەکەمانن، دژی ئێرانن، ئەمانە سەردەمی ساواک ساواکی بوون، ئێستاش لە لایەن خومەینییەوە پارە وەردەگرن، ئەوانە خراپکار و کرێگرتەن. ئەوانە خەڵکی هان دەدەن. خەڵکێک کە خۆی بتوانێت ئاسایشی شارەکەی خۆی دابین بکات چ پێویستی بە قیادەی موەقەتە هەیە، ئەوانە مامۆستا هەرە باشەکانی ئێمە بە ناوی کۆمۆنیستبوونەوە دەگرن و ئەشکنجەیان دەدەن و دەیانخەنە زیندان.

ئێمە بێ بەرامبەر و خۆبەخشانە پارێزگاری لە سنوورەکان دەکەین، من دەستم لە ژیان و ماڵ و حاڵی خۆم هەڵگرتووە و ئەوە شەش مانگە پارێزگاری دەکەم، ئینجا بە منی ڕیشسپی دەڵێن (دژەشۆڕش) و بەو ناکەسە تێکدەرانەش کە مانگی دوو هەزار تومەن لە قومەوە وەردەگرن دەڵێن (موجاهید)، بنووسە

---

١- قیادەی موەقەتە- سەرکردایەتی کاتی پارتی دیموکراتی کوردستان(ئێمەش هەروا بە قیادەی موەقەتە ناویان دەبەین چونکە لە نێو کورد زیاتر بەو ناوە دەناسرێن، بەتایبەت لە نێو کوردی ڕۆژهەڵات).

٢- دوای ئەوەی شۆڕشی کوردستان هەرەسی هێنا خەڵکی کوردی پەنابەر بەسەر شار و گوندەکانی ئێراندا پەرشوبڵاو کران، بەڵام بنەماڵەی بارزانی و هەندێ کەسی نزیکی ئەوان لە عەزیمیەی کەرەج کە شوێنێکی خۆشی نزیک تارانی پایتەختە جێگیر کران.

٣-مەهدی بازرگان ١٩٠٧-١٩٩٥ یەکەمین سەرۆکوەزیری ئێران دوای رووخانی رژێمی محەمەدڕەزاشا.

ئەمە گاڵتەجارییە، ئێمە دژەشۆڕش، کوردی ئێران دژە شۆڕشە، بەڵام قیادەی موەقەتەی تێکدەری عێراقی، موجاهید و پشتیوانی ئیسلامە؟! ئەمانە بنووسە.

خەڵکی مەریوان، خەڵکی کوردستان هەموویان خۆبەخشن، ئەگەر دوژمنێک پەنجە بۆ ئێران درێژ بکات گیانی خۆیان بەخت دەکەن، ئێمە گیانفیدای ئێرانین، گیانفیدای کۆمارین، بەڵام نەک ئەو کۆمارەی کە دژی ئێمە ڕاست بۆتەوە، نەک کۆمارێک کە پشتیوانی و لایەنگیری دەرەبەگەکان بێت. ئێمە بۆ ئەو کۆمارە گیانفیداین کە لەگەڵ گەل بێت، کۆماری گەل بێت، ئێمە هەموومان سەربازی ئێرانین، تەنیا ئێران دەناسین، ئێرانمان دەوێت، بۆچی کەس نییە لەمە تێبگات، بۆچی کەس قسەی ئێمە نابیسێ، مەگەر ئێمە چی دەڵێین کەوا هەموویانی تووڕە کردووە، خوا مێوەیەکی پێ داوە کە دەبێ هەموویان لێی بخۆن، دەبێ ماف و پشکی گەلانی دیکەشی لێ بدەن. ئێمە تەنیا لەو مێوەیەی کە ئێوە لێی دەخۆن پشکی خۆمان دەوێت. ئێمە جوداخواز نین. سەد جار ئەمە بنووسە، کە ئێمە جوداخواز نین، ئێمە خوامان دەوێت، ئیسلاممان دەوێت، ئێرانمان دەوێت، کوردستانمان دەوێت، لاوەکانی خۆمانمان دەوێن، کەسێک لە ئێمە دژی شۆڕش نییە، ئەگەر یەکێکمان کەوتبایە دەستی شا پارچەپارچەی دەکرد، ئێستا خێرە ئێمە بووینە دژی شۆڕش! من ئاسنگەرم، بەخوا چل هەزار تومەنم زیان وێکەوتووە، تەنیا لە پێناو ئەم کۆمارەی کە ئێستا خەریکە لاوەکانمان دەکاتە نیشانە و دڵیان دەپێکێ. بیستوچوار سەعات لەبەر باران و بەفر و گەرمادا نۆبەتم گرتووە و دیدەوانیم کردووە، ئێمە ئێرانمان دەوێت، ئێرانێکی بێ ساختەکاری و ڕاست و دروست و بێ غەلوغەش. ئاخر ئەمە چ بەزمێکە ناویانەتەوە کەوا کرێکار بۆتە دژی شۆڕش، جووتیار بۆتە دژی شۆڕش لەجیاتی ئەوان موفتی

زاده[1] بۆته زانا و شۆڕشگێڕ، قیادەی موەقەته بۆته موجاهید.

ئەمانە هەر بنووسی، بشنووسە ئێمە سەرمان لەوە دەرناچێت."

قسەکانی ئەو پیاوە ئاسنگەرە تەواو دەبن، من خەریکە سەرەداوەکان دەدۆزمەوە و سەر لەهەندێ شت دەردەکەم، بۆ نموونە "یەکێتیی جووتیاران، قیادەی موەقەتە، موفتی زادە، دەرەبەگەکان، ڕێکخراوی زەحمەتکێشانی شۆڕشگێڕی کوردستان. چەند جار دەمبیست کە بەڕێزەوە ناوی ئەو ڕێکخراوەیان دەهێنا و لە بارەیەوە دەدوان. زۆر باسی "ڕێکخراوی چریکە گیانفیداکانی گەل- چریکهای فدایی خلق"یش دەکرێت، دڵنیام دواتر لەگەڵ ئەمانە زیاتر ئاشنا دەبم. ئێستا بە ئاسوودەیی دەتوانم لەگەڵ پێشمەرگەکان پەیوەندی بکرم. چیدی پرسیار ناکەم، هەرکەس قسەیەکی هەبێت خۆی دێت و پێم دەڵێت. پیاوە ئاسنگەرەکە، کە قسەی خۆی کرد، پێشمەرگەیەکی دیکە دێتە پێش، هەروا کە لەژێر درەختێک دانیشتووم دێت لە تەنیشتم دادەنیشێت و دەڵێت:

"ڕێگەم بدە با من پێت بڵێم گەلی کورد چیی دەوێت".

خێرا قسەکانی کە هەم بۆ من و هەم بۆ ئەوانی دیکەشیان دەکات، دەنووسمەوە:

"من نوێنەری یەکێتی جووتیارانی سەقزم."

تفەنگێکی (ژ۳)ی بە شانەوەیە، جامانەیەکی گەورەی

[1]-ئەحمەد موفتی زادە۱۹۲۲-۱۹۹۳کەسێکی خاوەن نفوز و زانایەکی سوننە کە لەسەرەتای شۆڕشی ئێران خەڵکێکی لە دەوری خۆی کۆ کردەوە و لەلایەن هێزە سیاسییە نیشتمانییەکانی کورد بە کەسێکی خراپ و جووڵانەوەکەی بە جووڵانەوەیەکی دژی بەرژەوەندیی گەلی کورد دەبیندرا.

بەستووە و دوو ڕیز فیشەکی لە پشتی ئاڵاندوون.

دەڵێم: "نوێنەری کام یەکێتی، ئەم یەکێتیی جووتیارییە چییە، چۆن دروست بووە؟"

دەڵێ: "ئێمەی جووتیاران لە بەرامبەر یەکێتیی ئاغاکاندا یەکێتییێکی جوتیارانمان پێکهێناوە کە لە سەرانسەری کوردستاندا دەسەڵاتی گرتۆتە دەست، ئەمە باسێکی درێژە."

پاشان تێدەگەم، بەڕاستی چیرۆکی پێکهێنانی ئەو یەکێتییە درێژە. ئەو لەسەر قسەکانی بەردەوامە:

"سەیرکە، یەکەم شت هەر کەسێک لەم دنیایەدا سەر بە نەتەوەیەکە و ئێمە ئەو خۆبەڕێوەبەرێتییەمان بۆ کوردستان دەوێت و دیموکراسیش بۆ ئێران. ئەو خۆبەڕێوەبەرێتییەی بە مافێکی خۆمانی دەزانین بۆ گەلانی دیکەی ئێرانیش بە مافێکی ڕەوای دەزانین، چ عەرەب چ تورک، چ کورد، چ تورکمەن بۆیان هەیە داوای ئەو مافەی خۆیان بکەن. هەر ناوەندێک، هەر دەزگایەک ئێمە بە جوداخواز پێناسە بکات مەحکومی دەکەین. هەر جۆرە خۆبەڕێوەبەرێتییەک بدرێت دەبێ دەوڵەت ڕاستەخۆ لەگەڵ نوێنەرانی جووتیاران و کرێکارانی کوردستان پەیوەندی بگرێت. ئێمە خۆبەڕێوەبەرێتییێکی ئاوا بە ڕاست دەزانین نەک ئەوەی خۆیان ببڕن و بیدورن. ئێمە گەلی کوردستان بەکردەوە و بە پێی ئەو هەنگاوانەی ئەنجاممان داون شێخ عێزەدینی حوسێنی بە نوێنەری ڕاستەقینەی گەلی کورد بەتایبەت کرێکاران و جووتیارانی کوردستان دەزانین و دەوڵەت لەگەڵ هەر کەسێکی دیکە بە ناوی نوێنەری گەلی کورد پەیوەندی بگرێت، ڕەتی دەکەینەوە و مەحکومی دەکەین.

دەبینین ئەو دەوڵەتە بۆ ئەوەی خۆی ڕاستەوخۆ لەگەڵ گەلی کورد دەرگیر نەکات هاتووە قیادەی موەقەتە و دەرەبەگە خۆجێییەکانی ڕێکخستوون و بەری داونەتە گیانی گەلی کورد،

ئەوە ڕەفتاری دەوڵەتە بەرامبەر بە ئێمە.

لەلایەکی دیکە بۆ ئێمە ساغ بۆتەوە کە سوپاش دژی گەلە، بڕۆ نەغەدە و بە چاوی خۆت شوێنەواری تاوانەکانی سوپا ببینە. ئەم سوپایە هەر سوپای شاهنشاییە. جووتیارانی کوردستان لە ترسی دەرەبەگ و قیادەی موەقەتە و کۆنەپەرستانی نێوخۆ نان لە دەمی منداڵەکانی خۆیان دەگرنەوە و دەچن چەکی پێ دەکڕن، لە بەیانییەوە تا شەو دادێت کار دەکەن، شەویش تا بەیانی پاسەوانی دەگرن و پارێزگاری دەکەن. ئەمەیە ڕەوشی ئاسایش و ژیانی جووتیاران لەم سەردەمی شۆڕشی تازە و دەوڵەتی کاتییەدا.

واباشە ئەم دەوڵەتە دستی خۆی بۆ ئێمە بکاتەوە بۆ ئەوەی بزانین داخۆ خۆی باوەڕی بەو شۆڕشە نیوەچڵە هەیە یان نا! ئەگەر باوەڕی پێیە بۆچی مافی خەڵک نادات؟ ئێمە خۆبەڕێوبەرێتی بە مافێکی یاسایی و نەتەوەیی خۆمان دەزانین و تا دوا تنۆکی خوێنمان لەپێناو خۆبەڕێوەبەرێتیی کوردستان خەبات دەکەین، ئەگەر دەوڵەت بیەوێت لەگەڵ کورد پرسەکە بە دانوستان چارەسەر بکات، دەبێ بزانێت نوێنەری کورد (شێخ عیزەدینی حوسێنی)[1]یە، نەک کوردفرۆشانی وەکو موفتی زادە،

---

[1] - شێخ عیزەدین حوسێنی کوڕی شێخ سالح لە سەیدانی بەرزنجی، لەدایکبووی ساڵی ١٩٢١ی شاری بانەیە، یەکێکە لە زانایانی ئایینی و تێکۆشەرێکی ماندوویینەناسی ڕێگای ئازادی و دیموکراسیی خەڵکی کوردستانە و لە ماوەی زیاتر لە نیو سەدەدا لەپێناو ئازادیدا خەباتی کردووە و باوکیشی یەکێک بووە کە پشتیوانی شۆڕشەکەی شێخ مەحموودی حەفیدی کردووە. شێخ عیزەدینی حوسێنی لە ٢٠١١/٢/١٠ لە تەمەنی ٨٩ ساڵیدا لە شاری ئۆپسالای سوید ماڵاوایی لە ژیان کرد و تەرمەکەی هێندرایەوە کوردستان و لە گردی سەیوان لە سلێمانی بە خاک سپێردرا.

بەڵام ئێمە خۆمان هەموو شتێک دەزانین، ئەم دەوڵەتەی «قوم» هیچ جیاوازی لەگەڵ دەوڵەتەکەی شا نییە.."

پێشمەرگەکە دەست دەداتە تفەنگەکەی و هەڵدەستێ و دەڵێت:

"ئێمە خۆمان دەزانین کە ئێستا دەبێ خوێنمان لەپێناوی خاکی کوردستان بڕێژین تا دەگەینە ئامانجی خۆمان."

من هیچ قسەیەکم نییە بیکەم، تەنیا گوێ دەگرم، لەگەڵ پێشمەرگەکان بە سەعات قسە دەکەم، ئێستا ئیدی هەست بە نامۆیی ناکەم.

ئەم ڕێبەرییەی شێخ عیزەدین و بابەتی هێنانەپێشی موفتی زادە لەلایەن دەوڵەتەوە بۆمن ناڕۆشن بوو، لەیەکێک لە پێشمەرگەکان کە خوێندکاری کۆلێژی تەکنیکی زانکۆی تارانە دەپرسم لەو بارەیەوە ڕات چییە؟ دەڵێت:

"شێخ عیزەدین ئێستا، تا ئەم کاتە نوێنەری بەرەی پێشکەوتنخوازە و نوێنەربوونەکەی لەبەر ئەوەیە کە هەنگاوبەهەنگاو، بەڵام لێبڕاوانە لە کۆنەپەرستی ناوەخۆ دووردەکەوێتەوە و لە هێزە پێشکەوتووەکان بەتایبەت جووتیاران نزیکدەبێتەوە، بەڵام موفتی زادە نوێنەری کۆنەپەرستیی ناوەخۆیە و بە پێچەوانە هەنگاوبەهەنگاو لە هێزە پێشکەوتنخوازەکان دووردەکەوێتەوە و تێکەڵی کۆنەپەرستانی ناوەخۆ و زەویدارە گەورەکان دەبێت، بە شێوەیەک کە ئێستا دەوڵەت کردوویەتی بە داردەستی خۆی بۆ سەرکوتکردنی گەلی کورد. بێگومان لەبارەی پەیوەستبوونی شێخ عیزەدەین بە هێزە پێشکەوتووەکان، ئەمە تاکتیکێکە بەرامبەر نۆکەرانی قوم و ڕوخسارەکانی دیکەی حکومەتی ناوەندی و کەشوهەوای حوکمڕان، ئەوەی دەمێنێتەوە لە دەستی خودی شێخ خۆیەتی داخۆ تا چەند دەتوانێت لەگەڵ هێزە پێشکەوتووەکاندا هەڵبکات و

لەگەڵیان بێت، تا ئێستا باشی هێناوە، بەڵام ئەگەر کەمێک لابدات ئەوا خۆی دەتوێتەوە و تەواو دەبێت.

خەریکە تاریک دادێت، بەڵام هێشتا زۆر قسە هەن بۆ بیستن. ئاخاوتن زۆرە، بەڵام لە بارەی حیزبی دیموکراتەوە هێشتا هیچم نەبیستووە، بۆیە هەر لەو نوێنەرەی جووتیارانی سەقز لە بارەی حیزبی دیموکرات دەپرسم.

وەڵامم دەداتەوە:

..........[1]

..................حیزبی دیموکرات لەم ناوچانەی سنە و مەریوان و بانە و سەردەشت لایەنگری نییە. چەقی هێز و دەسەڵاتی ئەو حیزبە مهاباد و دێهاتەکانی دەوروبەری مهابادە... دێهاتییەکانی دەوروبەری مهاباد و ناوچەکانی ورمێ و ئەو ناوچانە زۆر پشتیوانی لەو حیزبە دەکەن.

هەروەها بەهۆی ئەو دێهاتییانەشەوەیە کە دەسەڵاتی هەیە و ئەو هێز و توانایای کە ئێستا ڕێبەرانی ئەو حیزبە هەیانەبەهۆی خەباتی قازی محەمەد و شەریفزادەکان و موعینییەکان و مەلا ئاوارەکانە و خەڵکیش لەبەر ئەوانەیە کە حیزبی دیموکراتیان خۆشدەوێت و لەبەر ئەو قارەمانانەمانە کە دێهاتییەکان چاوبەستە خۆیان بە ئەندامی ئەو حیزبە دەزانن، بەڵام ئەو ڕێبەرانەی ئێستا ناتوانن وەکو موعینییەکان و شەریفزادەکان لە خەمی خەڵکدابن.

هەوا تاریک داهاتبوو کە لە بارەگاکە هاتمەدەر، ویستم بچمە نێو بازاڕ و لە هوتێلێک پشوو بدەم، یەکێک لە پێشمەرگەکان هاتەپێش و گوتی: "ئەوە بۆ کوێ دەچیت؟"

---

[1] - ئەو قرتاندن و سانسۆرانە، لە چاپە فارسییەکەوە کراون، کە پێدەچێت لە لایەن نووسەر خۆیەوە بن.

-"هوتێل".

"ناچینه هوتێل، دەچینەوە ماڵی ئێمە".

له بەرانبەر فەرمانەکەیدا وەڵامێکم نەبوو. لەگەڵ چەند کوردێکی دیکە پێکەوە بەرەو ماڵی پێشمەرگە گەنجەکە ڕۆیشتین. لە چەند کۆڵانێک ڕەت بووین، پێشمەرگەکە لە بەردەم دەرگایەکی دارینی کۆندا ڕاوەستا و بانگی کەسێکی کرد، ڕەنگ بێت بانگی هاوسەرەکەی کردبێت، هەر هێندەی بڵێی یەکودوو ژنێکی گەنج کە منداڵێکی چکۆلەی بە باوەشەوە بوو هاتەدەر. ژنەکە جلێکی سووری پوولەکەداری کوردی لەبەردابوو و بە ڕەفتەیەکی ڕەنگین سەری خۆی بەستبوو، قژی هۆنیبووەوە و کەزییەکانی بە دوولادا بەردابوونەوە. منداڵەکەی دایە پێشمەرگەکە، بە کوردی شتێکی گوت، ڕەنگ بێت واتاکەی ئەوە بووبێت کە:

"بەخێر بێن بەڕێزان، فەرموون، ماڵ ماڵی خۆتانە".

چووینە ماڵی پێشمەرگە گەنجەکە، حەوشەی ماڵەکەیان بەرتەسک و تاریک بوو، ژوورەکان بە زەحمەت جێی سێ کەسیان تێدا دەبووەوە. زۆری نەبرد کە ژنە گەنجەکە بە مەجمەیەکی پڕ لە خواردن هاتە ئەو ژوورەی ئێمەی لێبووین، ئێمە برسیمان بوو تا توانیمان خواردمان. ژنی پێشمەرگەیەکی کورد بە جۆرێک خواردن دروست دەکات کە ئەگەر مێردەکەی تەواوی پێشمەرگەکان لەگەڵ خۆی بێنێتەوە ماڵێ خواردنەکە کەم نابێ و بەشی هەموویان دەکات.

ڕۆژی دواتر بەنێو شاردا پیاسەیەکم کرد، فەرمانگەی پۆلیس، فەرمانگەی ژاندارمەری، دادگا هەمووی لە دەستی گەنجەکاندان. ئەوان بە سواری کامیۆنی سەربازی لەنێو شاردا دێن و دەچن و دەروازەکانی شار کۆنترۆڵ دەکەن. لەگەڵ میوان و کەسانی بیانی بە ڕێزەوە ڕەفتار دەکەن، یەکەمین قسەی کە

دەیکەن ئەوەیە:

"دەبینی کاکە، هەموویان درۆ دەکەن، ڕادیۆ درۆ دەکات، ئاخوند درۆ دەکات، هەموو ئەوانەی قوم درۆ دەکەن. تۆ سەیری دەوروبەری خۆت بکە، بزانە ئێمە مافی ئەوەمان هەیە کە چارەنووسی خۆمان بە دەستی خۆمان دیاری بکەین یان نا؟"

کابرای میوان سەیری دەوروبەری خۆی دەکات، دەبینێ کە ئەو خەڵکە ستەمدیدەیە، ئەو خەڵکەی کە لەبیر بردراونەتەوە، ناچارن و هیچ چارەیەکی دیکەیان نییە، هەر دەبێ چەک هەڵبگرن، ئەمانە پێشمەرگە چەک بە شانەکانی خۆیان دەخەنە بان چاویانەوە.

یەکێک لە دێهاتییەکان دەیگوت:

"ئەگەر ئێمە زانیمان پێشمەرگەیەک وا بەرەو گوند دێت، بە پیرییەوە دەچین و پێشوازی لێدەکەین، ڕێزی لێدەگرین، چونکە ئێمە ئەوە دەزانین کە هیچ کەس جگە لە مرۆڤەکانی خۆمان ناتوانێت ئەم خاکە و ئەم لەتە نانەی دەیخۆین بۆمان بپارێزێت."

"ئێستا ئیدی، خەڵکی ئێمە دەزانێ کە جگە لە کەسانی خۆمان نابێ متمانە بە هیچ کەسی دیکە بکەین."

دەیگوت:

"کاکە خۆتان ببینن کەوا ئەو دەوڵەتەی ئیسلامی، ئەو ڕیشدارانە، زێڕی ژنەکانی ئێمە بە ناوی ژێردەستەکان دەبەن، پاشان دەچن دەیدەن بەو ئاغایانە، دەیدەن بە بارزانی بۆ ئەوەی لە قیادە موەقەتەییەکان خەرجی بکات تا بێن و بە سەر ئێمە دابدەن. ئیسلام ئەمە دەڵێ؟ خوا ئەمە دەڵێ؟ ئێوە بڕۆن ژیانی حەزرەتی محەمەد بخوێننەوە و ببینن داخۆ ئەوەی گوتووە؟!

پیرەمێردێک دەیگوت:

"ئەم دەوڵەتە خراپترە لە ڕژێمی شا. بەهیچ شێوەیەک متمانەی پێ ناکرێت، هەر بینیت فڕۆکەکان هاتنە سەرمان و

دایانگرتینه بەر ریژنەی گوللە."

لە شار باس هەر باسی ئەوەیە کە دەوڵەت هی ئەوە نییە متمانەی پێ بکرێت، باوەڕ بە ئیسلامەکەی ئەوانە ناکرێت، هەر بینیت بۆمبارانیان کردین.

یەکێک لە پێشمەرگەکان دەیگوت:

"لە شەڕی ڕووبەڕوو هەر کوردێک بارتەقای دە کەسی دوژمنە، بەڵام لە ڕێگەی فڕۆکەوە... نازانم."

گوتم: "دەوڵەت شتی وا ناکات."

گاڵتەی پێکردم و گوتی: "چۆن دەزانی نایکات، مەگەر لە نەغەدە نەیکرد؟"

پیرەمێردێکی چاویلکە لەچاو لە تەک ئێمەدا وەستاوە و چەکێکی پێیە، دەستێکی لە شانی دام و گوتی: "بنووسە، من ناوم محەمەدە نەک ئەحمەد."

تێنەگەیشتم مەبەستی چییە، تەنیا سەروسیمای دەریدەخست کە تەمەنێک خەباتی کردووە. دووبارە گوتی:

"جێی سەرسوڕمان نییە، ناوم محەمەدە لە دەفتەرەکەت ئەوە بنووسە."

ئەوانەی دەوروبەر لەگەڵ پیرەمێردەکە دایانە پێکەنین و ئەو بە پێکەنینەوە درێژەی بە قسەکانی دا:

"ئەحمەد ناوی ئەو موفتی زادە بەکرێگیراوەیە، من ناوم محەمەدە."

دواجار تێیگەیشتم، پیرەمێرد ناوی ئەحمەد بووە، بەڵام لەبەر ئەوەی هاوناوی ئەحمەد موفتی زادەیە، پێی شەرمە بۆیە ڕۆژێک هاوڕێکانی کۆ دەکاتەوە و ڕادەگەیەنێت کە:

"لەمڕۆ بەدواوە من ناوم محەمەدە، ئەحمەد ناوی ئەو موفتی زادە عەللامە بەکرێگیراوەیە."

***

# دەڵێن چوون بۆ گوندەکان ترسناکە بەڵام من بە گوێیان ناکەم و دەچمە گوند

لە چەند کەسێکم پرسی داخۆ چۆن دەتوانم بچمە گوندەکان، هەموویان بە سەرسوڕمانەوە دەیانپرسی:

"ئێستا کەی کاتی ئەوەیە بچیتە گوند، ترسناکە."

لە پیاوێکم پرسی کە تەمەنی نزیکەی چل ساڵ دەبوو:

"ئوتومبێلەکانی گوند لە کوێن، لە کوێوە دەبێ بۆ گوند بچین؟"

بە میهرەبانییەوە گوتی: "نازانم بۆچی دەتەوێت بچییە گوندەکان، بەڵام بە چاکی نازانم بچیت."

هەموویان دەیانگوت نابێ بچیت، خەڵکی ئێستا نیگەرانن، گومان لە هەموو کەسێکی بێگانە دەکەن. کەوتمەڕێ، لە شوێنێک پیکەبێک دە دوازدە کەسی سوار کردبوو، دیاربوو بۆ گوندەکان دەچوو، لە شوفێرەکەم پرسی "دەچیە کوێ؟"

گوتی : "خاو"

نەمپرسی خاو لە کوێیە، لە پشتی پیکەبەکە لەگەڵ ئەوانی دیکە سوار بووم و وەڕێکەوتین، هەموویان بە سەرسوڕمانەوە سەیریان دەکردم. گەنجێک پرسیی: "دەتەوێ بچیتە کوێ؟"

"نازانم"

بە تووڕەییەوە سەیری کردم. یەکێکی دیکە پرسیی:

"لایەنگری خومەینی؟"

ئەو تووڕە و گرژ دیار بوو. لە وەڵامیدا پێکەنیم، گوتی:

"ئەگەر لایەنگری خومەینی بیت لەو کێوانە لەتلەتت دەکەن، بگەڕێوە پێویست ناکات بێیت."

ئەوەی یەکەم هاتە دەنگ کە "بۆ بڵاوکردنەوەی ژەهر هاتوویت، ساواکیی خومەینیت، چیت لە خوێنی ئێمە دەوێت؟" گیرم خواردبوو، بەڵام نەدەترسام، گەنجێکی حەڤدە هەژدە ساڵە کە قیافەیەکی شوانانەی هەبوو گوتی:

"پێناچێت ساواکیی خومەینی بێت، قیافەی پێ ناچێت، پێدەچێت کۆمۆنیست بێت."

پاشان بە کوردی شتێکی بە ئەوەی دیکە گوت، وەک بڵێ منی لەگەڵ پێشمەرگەکانی بارەگا بینیوە، ئەوەی یەکەم پێکەنی و گوتی:

"کۆمۆنیست کێشە نییە، کەواتە کەس گرفتت بۆ دروست ناکات، بەڵام ئەگەر بکەویتە دەستی قیادە موەقەتە سمێڵت دەردێنن."

پێم خۆش بوو بکەومە دەستی قیادە موەقەتییەکان تا بزانم ئەوانە چ جۆرە جانەوەرێکن، دواتر ڕووبەڕووی قیادە موەقەتەییەکانیش بوومەوە، بەڵام لەنێو ئەواندا جگە لە کەسانێکی برسی، نەخوێندەوار و داردەست شتێکی دیکەم نەبینی. ڕەفتاری هاوسەفەرەکانم نەرمتر بوو. هاوسەفەرەکانم لە درێژایی ڕێگاکە یەک دوای یەک دادەبەزین و دەم نادەمێکیش لە منیان دەپرسی تۆ دەتەوێت بچیتە کوێ و من وەڵامێکم نەبوو. هەر سەرنشینێک دادەبەزی دەبووا بە نێو کێڵگەی گەنم و نۆکدا ڕەت بووبا، لە چەند تەپۆلکەیەک بەسەردەکەوت، تا دواجار دەگەیشتە سەر کانییەک و چەند خانووێکی لە خشتوقوڕ دروستکراو، ئەوێش دێیەکەیە. ئەو پیکەبانە کە تاکە ئامرازی

گواستنەوەن بە ڕێکەوت دەردەکەون و دیسان هەر بە ڕێکەوت دێهـاتییەک لە سـەر تەپـۆلکەیەک پیکـابەکە ببینـێ و لەوێـوە بەڕاکردن و هاوارکردن شوفێرەکەی تێبگەیەنێت کە بوەستێت و ئەویش لە دواوەی پیکەبەکەی سوار بکات.

ئێستا سێ کەسی دیکە لە دواوەی پیکەبەکەدا سوار بووین. یەکێکیان گوتی:

"ئێمە ئێستا دەچینە خاو، تۆ چ کارێکت لە خاو هەیە؟"

-"نازانم، هەروا دێم کە بیبینم." سەری ڕادەوەشێنێت.

لە جادەیەکی خۆڵ و پڕ کەند و قوڵت تێپەڕین، بەنێو پەرێزە گەنمێکدا کە جووتیارەکان خەریکی درووێنە بوون و بەتەنیشت کێڵگەی نۆکان کە ژنـان خەریکـی دەسـکەنە و کۆکردنەوەیـان بوون تێپەڕین، بە تەک مێگەلی مەڕ و کانی ئاو و تەپۆلکەی پڕ داربەڕوو ڕەت بووین تا گەیشتینە 'خاو'. گوندێک کە خەڵکەکەی خەڵکێکی ڕەنجدەر، سـەخت و ئازاردیـدە، مانـدوو کە کاریـان چانـدنی گەنـم و نـۆک و مەڕو مـاڵات بەخێـو دەکەن و لە سـەردەمی تـاغووت تفەنگەکانیـان لە ژێـر خاکدا شـاردۆتەوە و ڕۆژانـی شـۆڕش کە دەچـنە نێـو کێڵگەکانیـان تفەنگەکانیـان بە شـانەوەیە. خەڵکـی سـەر سـنوورەکانن و پاسـەوانی لە سـنوورەکانی خۆیـان دەکەن. کەسـانێک کە لە دەوری یەکـدی کۆبـوونەتەوە و لە پەنـا گردێـک لە نزیـک سـنووری عێـراق ٢٥ خانووی بچووکیان بە خشتو قوڕ پێکەوە ناوە، دوور لە هەموو شتێک و هەموو لایەک بێ ئاو، بێ کارەبا، بێ خوێندنگە، بێ دکتۆر و.. ناویان لێناوە خاو و بە ئاواتی کوردستانێکی ئاوەدان خەبات دەکەن.

لە ڕێگادا کاتێک ئەو سێ هاوسەفەرەم تێگەیشتن کە من بە ڕاستی ساواکی خومەینی نیم و کەسێکیش لەم ناوە ناناسم، جگە لەوە ناشزانم دەمەوێ چی بکەم، یەکێکیان گوتی:

"ئێمه بۆ سەرەخۆشی دەچینه خاو، خزمێکمان کۆچی دوایی کردووه، لێره ئۆتومبێلت دەست ناکەوێت پێی بگەڕێیتەوه، دەتەوێت چی بکەیت؟"

گوتم:

"منیش دێمه سەرەخۆشییەکه."

هەموویان پێکەنین و بڕیار درا لەگەڵ ئەوان بچمه پرسەکه. کاتێک پیکەبەکه له بەردەم مزگەوتەکه ڕاوەستا، کۆمەڵه خەڵکێک بەپیرمانەوه هاتن، پیره پیاوێک که فەقیانەی سپی درێژ درێژی بەستبوون له پێش خەڵکەکەوه بوو، کوردانی «خاو» هەموویان بەخێرهاتنییان لێکردین. سێ کوردە هاوسەفەرەکەم سەرەخۆشییان لێکردن، منیش به زمانی فارسی سەرەخۆشیم لێکردن، هاوسەفەرەکانم دەستی پیرەمێردەکەیان ماچ کرد، منیش وامکرد. دواتر زانیم ئەوه مەلای گوندەکەیه. بەڕێزەوه ئێمەیان بردە مزگەوتەکه، مزگەوت رووت و ساده بوو، هەروەک خاو، پیرەمێردەکه دوعای بۆ هەمووان کرد، دوعای بۆ کوردستانیش کرد و گوتی فاتیحا بخوێنین. هەموویان فاتیحایان خوێند. چایان هێنا. پیاوه پیرەکه بەکوردی قسەی دەکرد و هەموویان گوێیان دابووێ، من تێینەدەگەیشتم. سەیری قیافەکانیانم دەکرد، ئەو هاوسەفەرانەم ترساندبوومیان. ئەمانه کەسانێک بوون سەختی و ساردی و گەرمیان چەشتبوو، هێمن، سەبوور و له هەمان کاتدا کەسانێک بوون که ئەو دەمەی نوێژ و فاتیحاشیان دەخوێند چەکیان له تەنیش خۆیاندا درێژ دەکرد، تۆ که له قسەکانیان ناگەیت و سەیریان دەکەیت له دڵی خۆتدا دەڵێی:

"ئەمانه ئەو کوردستانەی که دەیانەوێت بەدەستی دێنن، بەڵام دەبێ سەبر بگرن و دەبێ گەنجانی خوێندەوار شانبەشانی ئەو خەڵکه بێنه کۆڕی خەبات و پێیان بڵێن که بۆچی تا ئێستا لەگەڵ

ئەو هەمــوو جەنــگ و قوربانیــدانەش، ســەرنەکەوتوون. دەبــێ تێبگەیەنــدرێن و فێــر بکــرێن کە تەنیــا بە چەک و تــا دوا تنــۆکی خوێن شــەڕکردن دەردەکە دەوا ناکات، دەبێ هۆشیار ببنەوە و شــەڕ بــکەن و دەبــێ بــزانن کە ڕیشــەی دەردەکە لە کوێــوەیە و ڕێــک نیشــانە لە دەردەکە بگــرن. دەبــێ خەبــات بــکەن بەڵام بە هەماهەنگی و هاوکاریی کوردانی دیکە و گەلانی دیکە."

میوان بیر دەکاتەوە:

'ئەمــانە ئەو کوردســتانەی کە مەبەســتیانە بەدەســتی دێــنن. تۆوی ئازادی و ئاوەدانی وەکو تۆوی نۆک و گەنم چەندین ساڵە لە سەر خاکی کوردستان چێندراوە و بە خــوێنی لاوەکانیــان ئــاو دراوە و هەرچۆنێــــک بێــــت پــــارێزراوە، بەڵام دەبــــێ لاوە خوێنــدەوارەکانیان بێــنن و فێریــان بــکەن و تێیــان بگەیەنــن بە یــارمەتی کــێ و بە یەکێتیــی لەگەڵ کــێ و لە چ کــات و ســاتێکدا داس هەڵبگرن و دروێنەی بکەن.'

* * *

## لە سنە

ئەمــڕۆ سێشــەممەیە، ئیمــام (مەبەســت خــومەینییە) داوای لە هەموو خەڵک کردووە کە لە ڕێپێوانی (وەحدەت[1]) بەشــدار بن و نیشــانی چــاوچنۆک و دوژمنــان بــدەن کە موســڵمانانی ئەم وڵاتە هێشــتا یەککگرتــوون و وەک ئەوەی شــەیتانەکان دەڵــێن وانیــیە و هــیچ درزێــک لە ڕیــزی یەکێتیــی موســڵمانانی ئێرانــدا دروســت

---

[1]-یەکبوون، لەسەر بڕیاری خومەینی ساڵی ١٩٧٩ ڕۆژێکیان دیاری کرد کە لە سەرتاسەری ئێران ڕێپێوان بکرێت بەحساب بۆ نیشاندانی یەکێتی و یەکبوونی شیعە وسوننە لە ئێران. ساڵانی دواتریش وەک نەریتیک ئەو ڕێورەسمە هەر هەیە.

نەبووە.

ڕادیۆ، تەلەڤزیۆن ڕێکلامێکی زۆری بۆ ئەو ڕێپێوانەی ئەمڕۆ کردووە. من ئەمڕۆ لە سنەم، خولێک بە نێو شەقامەکاندا لێدەدەم تا ببینم خەڵک چۆن بەپیر ئەو ڕێپێوانەوە دەچن، یان تێڕوانینیان لە بارەیەوە چۆنە.

لە سەر سووچی سێ ڕێیانی سەنتەری شار پیاوێک جگەرە دەفرۆشێت.

'کاکە ئەمڕۆ ڕێپێوان دەکەن؟'

-'پێم وانییە، نا، خۆشتان دەزانن.'

بە نێو شاردا پیاسە دەکەم، ڕەوشەکە ئاساییە، گەنجێک کە دەبێ خوێندکار بێت خەریکە ڕۆژنامەی چلنگر[1] دەفرۆشێت.

'ئەمڕۆ ڕێپێوان دەکرێت؟'

بە پێکەنینەوە دەڵێ: 'نە قوربان. ئێرە هەموو کۆمۆنیستن.'

مێرمنداڵێک ڕۆژنامە دێنێت.

-'ڕۆژنامەت دەوێ؟'

ج ڕۆژنامەیەکە؟'

کاتژمێر دەی بەیانییە. 'ڕۆژنامەی 'ئایەندەگان[2]'.

بەلامەوە سەیرە. دەڵێم 'ئایەندەگان ئێستا لە تارانیش دەست ناکەوێ چۆن بەو یەک دوو سەعاتە گەیشتۆتە ئێرە؟'

---

[1]-وشەی چەلەنگەر بە زمانی گیلەکی واتە قفل و کلیل.. ڕۆژنامەیەکی تەنزی سیاسی بووە لە ساڵی ١٩٥٠ بۆ ماوەی٢ساڵ دەرچووە و ڕاگیراوە، دوای شۆڕشی ئێرانیش دیسان دەست بە چاپکردنی کراوەتەوە و بەلام دیسان بەهۆی هێلە فکرییە پێشکەوتنخوازەکەی ڕاگیراوە چاپکردنی قەدەغە کراوە.

[2]-یەکێک لە ڕۆژنامە بەناوبانگەکانی ئێران کە یەکەم ژمارەی لە ساڵی ١٩٦٧ دەرچووە.. دواتر لە سەردەمی کۆماری ئیسلام ئەو ڕۆژنامەیەش دوای ماوەیەک ئیش کردن، ڕاگیراوە و قەدەغە کراوە.

مێرمنداڵەکە تەمەنی دە ساڵ دەبێ دەڵێ: "ئێرە هەمووی کۆمەنیستن، ئایەندەگان وەکو بروسکە بە فڕۆکە دەگەیەنن".
ڕۆژنامەیەک دەکڕم، مێرمنداڵەکە وەک بیەوێ فریوم بدات دەڵێ: "منیش کۆمەنیستم".

لە گەنجێک کە چەقۆ و دامبۆکس دەفرۆشێ، دەپرسم:
"ئەمڕۆ ڕێپێوان هەیە؟"
"لێرە ئەو شتانە هەر باس ناکرێن."

گەنجەکە گوتی: "کە قسە دەکەن باسیان هەر باسی شیعەکانە، کە یاسا دادەنێن هەر باسی شیعەکانە، سەرۆککۆمار لە شیعەکانە، بەڵام کاتێک ببینن ڕەوش خراپە دەڵێن، هەموو موسڵمانەکان وەرنە ڕێپێوان. دەڵێن شیعە و سوننی بران، ئەگەر برایەتی ئاوای لێ بێت هیچ کەس ڕێپێوان ناکات".

لە سەری کۆڵانی ماڵی ئەحمەدی موفتی زادە، چوار- پێنج گەنج لە دوکانێکی بەقاڵی دانیشتوون و خەریکی خوێندنەوەی ڕۆژنامەن. دەپرسم: "کوڕەکان ئەمڕۆ ڕێپێوان دەکرێت؟"

هەر ئاگایان لە ڕێپێوان و ئەو شتانە نییە "چ ڕێپێوانێک؟"

دەڵێم: "ئەوەی ڕۆژنامەکان نووسیویانە، ڕادیۆ دەڵێ ڕێپێوانی 'وەحدەت'.

دەڵێن: "فەرمانی ڕێپێوانەکە لە قومەوەیە؟"
"پێیوایە بەڵێ".
"ئێ کەواتە ئاشکرایە، هیچ کەس ڕێپێوان ناکات."
دەپرسم: "ماڵی موفتی زادە لە کوێیە؟"
بە سەرسوڕمانەوە دەپرسن: "چ کارت بە موفتی زادە هەیە؟"
"هیچ، هەروا دەپرسم".

"کاکە توخوا خەتێک بە سەر موفتی زادەدا بکێشە. ئەو کابرایە گەورە مەکەن. ئەو تاقمێک گەجەڕوگوجەری وەکو خۆی لە دەوری خۆ کۆکردوونەتەوە و بۆ خۆی دەزگا و نووسینگەی

کردۆتەوە، دەوڵەتیش پشتیوانی لەو جۆرە گەجەروگوجەرانە دەکات. وازی لێ بێنن، چ کارت بە موفتی زادە هەیە".

شێوەی قسەکردنیان جۆرێکە کە دەمخەنە ژێر فشارەوە، ڕێگای خۆم دەگرم بەرەو لای ئەو هوتێلە دەڕۆم کە لێی دابەزیوم.

***

## زانیاری زیاتر
## لەبارەی مەریوانەوە بەدەست دێنم

لە سنەدا توانیم لەگەڵ ئەو برادەرانەی لەگەڵیان ئاشنابووم هەندێک بابەت لە بارەی مەریوانەوە بزانم، یەکێک لەو بابەتانە سەبارەت بە (یەکێتیی جووتیاران)ە. ئێستا یەکێک لە گرێکان کراوەتەوە، ئەویش ئەوەیە کە یەکێتییە جووتیارییەکان دەناسم و لێرە بە دواوە زۆر بەکەڵکم دێ، شتگەلێک کە لەو بارەیەوە تێیانگەیشتم دەتوانم بڵێم بەم شێوەیەی خوارەوە بوو:

(بە هۆی ڕەوشی تایبەتی کۆمەڵایەتی و ئابووریی مەریوان و بە هۆی ئەوەی کە ئاغاکان لەوێ دەسەڵاتی زیاتریان هەیە و زیاتر جووتیاران دەچەوسێننەوە و بە هۆی ئەوەی کە هێشتا پرسە ڕەگداکوتاوەکانی دەرەبەگایەتی لە دێهاتەکانی مەریوان چارەسەر نەکراوە و جگە لەوە ئاغاکان بە شێوەیەکی بەردەوام پەیوەندیان لەگەڵ یەکدا هەیە و سیاسەت و هەنگاوەکانیان دژی جووتیاران پیادە دەکەن، بە هۆی ئەوەی کە خەڵکی مەریوان و دێهاتەکانی دەوروبەری بەر لە شۆڕش دەرگیری خەباتێک بوون دژی ئاغاکان، دەوڵەت، کۆمپانیا کشتوکاڵیەکان، شارەوانی، قایمقامیەت، ژاندەرمەری، پۆلیس و لەبەر ئەوەی هەموو ئەو ئیدارە و دامودەزگایانە بەویستی دەوڵەت لەژێر چاودێریی ئاغاکان دابوون و ئاغاکان بە هاوکاری ژاندەرمەری و هێزی سەربازگەی مەریوان هەموو زەوییە باش و بە پیتەکانیان

بۆخۆیان دانابوو و جووتیارەکانیان هەڵدابوونە زەوییە ڕەقەن و بەردەڵانییەکان و بە کورتی لەبەر ئەوەی کە شاری مەریوان بە گشتی لە دەستی ئاغاکاندا بوو ئەوان بە دەسەڵاتی خۆیان جادە و ڕێگاوبانیـان بەتەک کێڵگەکـانی خۆیانـدا دەبـرد و خانوویـان بەسەر خەڵکدا دەڕووخاند و بە ناوی دانانی باخچە و ڕاکێشانی جادە و جوانکردنی شار هەموو بەڵایەکیان بە سەری دێنشین و خەڵکی شاردەهێنا و بە هۆکارگەلێکی دیکەی زۆرەوە کە ڕەگ و ڕیشـەیان لە ئیمپریـالیزمەوە سـەرچاوە دەگرێـت، دێنشـینەکان ئەوەیان ساغ کردبووەوە و بە پێویستیان زانیبوو کە ئەوان یەک بگرن و لەو ڕووەوە کە ڕۆشنبیرانی کورد بەتایبەت ئەوانەی کە دەستیان لە ژیانی تایبەتی و خۆشگوزەرانی تاکە کەسی خۆیان هەڵگرتبـوو و لە دێهاتەکانـدا زۆرن و بەردەوام جـووڵانەوەی جوتیارەکانیـان لەبەرچـاوە، ئەو ڕۆشـنبیرە تێکۆشـەرانە کێشـەکەیان دەستنیشـان کـردووە و وەڵامـی ئەو پێویسـتییەیان داوەتەوە کە چیـدی نـابێ بێـدەنگەی لێبکرێـت. لە سـەردەمی حەمەڕەزا شـا بە شـێوەیەکی نهێنـی چەنـد یەکێتیـیەک لە چەنـد دێهاتێکی دەوروبەری مەریوان پێکدەهێنن، تا لە بەرامبەر یەکێتی و هاوبەنـدیی ئاغاکـان و ئەو سـتەمەی کە دەوڵەت لە گوندنشـینەکانی دەکـرد بتـوانن بەرگـری بکەن، ڕاستییەکەی ئەو بەرەنگارییەی کە ئەوکات دەکرا زیاتر بەهۆی دێیەکی وێران و کـاولبووی قەراخ شـار بـوو کە دەرەبەگەکـان بە شـێواز و نـاوی جیاجیـا، یـان بە پشـتگەرمیی هێـزە ئەمنییەکـان هەر جـارە و بە شـێوەیەک دەیانهێنـایە گۆڕێ، گوایە دێیەکە دیمەنـی شـارەکەی ناشـیرین کـردوە و پێویسـتە تەخـت بکرێـت، خـۆی مەبەسـتی ڕاستەقینەی دەرەبەگەکـان ئەوە نەبـوو، ئەوان چاویـان بڕیبـووە ئەو زەوی و ڕووبەرەی کە هـی دێـیەکە بـوو و دەیانویسـت دەسـتی بەسـەردابگرن و دێـیەکە تێکبـدەن و شـەقامێک لەوێ

لێبدەن، ئینجا هەمان شوێن بە پارەیەکی زۆر دیسان بە هەمان دێنشینەکان بفرۆشنەوە. خەڵکەکەش ڕازی نەدەبوون و ماوەی ساڵێکی ڕەبەق سکالای خۆیان لەم فەرمانگە بۆ ئەو فەرمانگە برد و هیچ بەرپرسێک نەما هاواری خۆی بۆ نەبەن و داوا نەکەن کە کێشەکە ئەوەیە و ئەوانە دەیانەوێ زەوییەکانیان لێبستێنن و ئەوان زەوییەکانی خۆیان دەوێت و بە بێ ئەو زەویانە ناتوانن بژین و ئەمە ڕەوا نییە و ستەمێکە لێیان دەکرێت، ئەمە بێدادییە، وەرن گوێ لە سکالاکانمان بگرن و خۆتان سەر لە دێیەکە بدەن و زەوییەکان ببینن، ئەوسا خۆتان بڵێن داخۆ مافی ئێمە نییە کە لەسەر ئەو زەویانەی خۆمان کار بکەین یان نا، ئایا بە چ ویژدانێک دەیانەوێتماڵەکانمان بەسەر سەرماندا بڕووخێنن و ژیانمان لێ تێک بدەن؟ بەو پێیەی کە لە سەردەمی ڕەزاشادا ئەوە ڕەوا بوو کە خانوو بەسەر ئەو دێنشینە هەژار و نەدارانەدا بڕوخێندرێت و دەست بە سەر زەوی و موڵکەکانیاندا بگیررێت و برسی و ماڵوێران بکرێن، کەس نەبوو گوێیان لێ بگرێت و بەدەنگیانەوە بچێت، دەرەبەگەکان دەستیان بەسەر زەوییەکاندا گرت و بە فیز و لەخۆباییبوونەوە گاڵتەیان بە دێنشینەکان کرد و لەسەر زەوییەکانی ئەواندا دایانکوتا، بەڵام لەو کاتەدا کە ئەو دەرەبەگە چاوچنۆکانە لەسەر زەوی و زاری ئەواندا دایانکوتا و ئەوانیان بێبەش کرد، ڕۆشنبیرانی شار بە فریای دێنشینەکانەوە چوون و بەشێوەکی نهێنی لەگەڵ نوێنەری چەند گوندێکدا ئەو باسەیان هێنایە گۆڕێ و ئەوانیان ڕاکێشایە نێو پرسەکە. تێز و بەرنامەی کاریان ڕێکخست، هێشتا زمانی پیس و هەڕەشەئامێزی دەرەبەگەکان لەبەرانبەر دێنشینەکان هەر درێژ بوو و هێشتا هەڕەشەکانیان هەر بەردەوام بوو کە سەدان دێنشین بە خاکەناس و گاسنەکانیانەوە، ڕێک ئەوکاتەی لەبەر زوڵم و

تاوانکارییەکـانی مـحەمەڕەزا شـا کەس نەیـدەتوانی هەناسـەش بدات، ئەوان لە گرد و تەپۆلکەکانی دەوروبەری شار دەرکەوتن و داڕژانە نێو شـار. لەو کـاتەدا هێشـتا شۆڕشـی خەڵکـی ئێـران نەکرابـوو. ئەوان هاواریـان دەکـرد 'زەوی، زەوی' لەو نێـوەدا دەنگیـان دەزرنگـایەوە و دەیـانگوت: بـۆ ئـێمە شـەرمەزارییە، شەرمەزارییە و دەبێ هەرچی زووە زەوییەکانمـان وەربگرینەوە و خۆمـان بەم خاکەنـاس و گاسـنانە و لەگەڵ ژن و منداڵەکانمان دووبارە بێینەوە سەر زەوییەکانمـان و بیانکێڵین و کاریـان تێدا بکەین.

شـــەپۆلی خرۆشـــاوی دێنشـــینەکان شـــەقامە باریکەکـــانی مەریـوانی داگرتبوو. ئەمە کەی، لەو کـاتەی کە مـحەمەدڕەزا شـا خۆی بە هەموو شتێک دەزانی و لەوپەڕی هێز و دەسەڵاتدا بوو، بەڵام لە شـــارێکی دوورەدەســـت و لاپەڕگەی وەک مەریـــوان، دێنشـینانی خرۆشـاو توانیـان ئەو دەسـەڵاتدارە کە هێـزی خـۆی وەک خـوایەک سـەیر دەکـرد، بهێنـنە لەرزە. جەنـدرمە زەنـدەقیان چوو، دادگا تەرازووەکەی دالەنگی و هاوسـەنگی تێکچوو. سـوپا بە هەراسانییەوە راپەرمـی، پۆلیس وەک سـەگی تۆڕی بەدەوری شـاردا خـولانەوە و کەوتـنە نووسکەنووسـک و سـەیری ئەو شـەپۆلە خرۆشـاوەی خەڵکیـان کـرد. دێنشـینەکان بە ژن و منداڵەکانیانەوە بە دەوری شاردا سووڕانەوە و هاواریـان کرد و هێشـتا دەرەبەگەکـان نەیـانتوانیبوو بکەونەخـۆ ئەوان خۆیـان گەیاندە نێو ئەو زەویانەی کە هـی خۆیان بوو و ساڵەهای ساڵ رەنـــج و ئارەقەیـــان لەســـەر ڕشـــتبوو. ئـــا لەو کـــاتە و لە چاوتروکانێکدا ساواک و جاشـەکان و پۆلیس و سـەربازەکان بە تۆپ و تانکەکانیانەوە ڕووبەڕوویـان بوونەوە و سـێڵاوی خوێن لەنێـو ئەو زەوی و کێڵگـانە ڕاسـا. دێنشـینە ڕاپەڕیوەکـان بە گورزی دەستی جەندرمە و یاسـاوڵەکانی دەوڵەت مێشـکیان پژا،

یان بە شیلکەی تفەنگەکان لە خوێندا گەوزین و خوێنیان ڕژایە نێــو زەوی و کێڵگەکــان، بەڵام چمــا ئەوان کۆڵیــان دا! هەر دێنشینێک دەکەوت ژنەکەی دەستی دەدایە پێمەڕەکە و شوێنی پیاوەکەی دەگـرتەوە و دەسـتی دەکـرد بە کـێڵان، کە ژنەکە لە خوێندا دەگەوزا، کوڕەکەی کە ئێش و ئازار چنگی لە دڵی گیر کردبـوو وەک بەچـکە گـورگێکی برینـدار شـوێنی دەگـرتەوە و دەستی دەدایە پێمەڕەکە و هۆهای لە گاجووتەکان دەکرد: بڕۆ ئەی گاجووتەکە، بڕۆ زەوییەکە بکێڵە و مەپرنگێوە و مەوەستە.

ئەو ڕۆژە ڕاپەڕینی دێنشینەکان خەڵتانی خوێن کرا، بەڵام لەو ڕۆژەوە یەکێتیــی جوتیـارانی مەریـوان بەشـیوەیەکی نهێنــی و کاریگەرانە لەنێو ئەو زەوییە بە خوێن نەخشاوانە چەکەرەی کرد و کەوتە سەر پێ.

بێگومان ناتوانین بڵێین ئەمە تاکە هۆکاری دروستبوونی ئەو یەکێتیـیە جووتیاریـانە بـووە، نەخێـر دەشـێ ئەمە بە یەکێـک لە هۆکارەکانی هاتنەدیی یەکێتییەکان بووبێت. دەبێ ئاماژە بەوەش بــدەین کە ئەو یەکێتیــیە جووتیاریــانەی مەریــوان لەگەڵ سەرهەڵدانی شۆڕشی ئێران و دواتر، بە خێرایی پەرەیان سەند و گەشــەیان کــرد و دێنشــینەکانی نــاوچەکەی یەکخســت و دەســەڵاتێکی جووتیــاریی گەورەی لەســەر ئاســتی نــاوچە کوردییەکاندا بە دەست هێنا. وەک دواتر دەبینین ئەو هاوبەندی و تەبــاییە ئەنجــامی پڕبەهــا و بایەخــداری لــێکەوتەوە، وەک نموونەش هەمان ئەو ڕێپێوانەی کە لە سنەوە بۆ مەریوان کرا و لەوەش گرنگتر ئەو کۆچکردنە نـاڕەزایەتییە بە کۆمەڵەی خەڵکی مەریوان کە شارەکەیان چۆڵ کرد و ڕوویان کردە کێوەکان. یان ئەوەی کە خەڵکی کامیاران لەبەردەم تانکەکانی ڕژێمدا لە سەر ڕێگا و جادەکاندا ڕاکشان و ڕێیان لە چوونی هێزی ڕژێم گرت. ئەمانە هەمـوو بە شـێوەیەکی کـاریگەرانە و بەرنـامەدار لەلایەن

ئەو یەکێتییە جووتیاریانەوە ڕێبەرایەتی دەکران.

هۆکارێکی دیکەی گرنگ کە لە دروستبوون و هاتنەکایەی ئەو یەکێتیانە ئاماژەی پێدەدرێت، بریتییە لە پاڵپشتی و هاتنە مەیدانی هێزە پێشکەوتنخواز و شۆڕشگێڕەکان کە شان بە شانی جووتیارەکان هەنگاویان نا و لەگەڵیان بوون و ئێستاشی لەگەڵدا بێت بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ئەو پەیوەندییەیان هەر بەردەوامە. لێرەدا ئەو پرسیارە دێتە پێش کە ئەوانەی ئەو یەکێتییە جووتیاریانەیان ئاوا خستە سەرپێ کێن و چ کەسانێکن؟

لەو بارەیەوە لە زۆر کەسانم پرسی و سەرم لە زۆر جێگایان دا تا هەندێ شتم دەست کەوت. دێنشینەکان، بەتایبەت گەنجە خوێندەوارەکانیان، پێیان خۆشە بۆ تۆ کە کەسێکی بێگانەی و هاتوویت زانیاریی لەو بارەیە وەدەست بخەیت، بە پارێزەوە ئەوەت تێبگەیەنن، کە ڕێکخراوێکی نهێنی هەیە و لە پشت پەردەوە خەریکی کارەکانی خۆیەتی. بۆ تۆ کە بە دوای ئەوەدا دەگەڕێیت کە لەو بارەیەوە زیاتر زانیاری وەربگریت، ئەوەت بۆ ڕوون دەبێتەوە کە بەڵێ ڕێکخراوێکی (مارکسیستی- لینینیستی) بەناوی "ڕێکخراوی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستان"[1] بە شێوەیەکی نهێنی لەناوچەکەدا کار دەکات و لەگەڵ ئەندام و جووتیارەکان و دێنشینەکاندا تێکەڵە و کەسەکانی وەک ڕوخساری ئاشکرا و دیار نەناسراون و ڕێکخراوەکە بنکە و بارەگایەکی نییە، ئۆرگانێکی ڕاگەیاندنی نییە، بەڵام بەیاننامە و بڵاوەکراوەکانی لێرە و لەوێ بەرچاو دەکەون و لە بارەی ئەو ڕووداو و بوویەرانەی کە لە کوردستاندا ڕوودەدەن، هەر زوو شرۆڤە و شیکردنەوەیان هەیە و تێڕوانینەکانی خۆیان دەگەیەننە دەستی خەڵک.

---

[1]-کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستان.

خەڵکی کوردستان بەڕێز و شکۆوە لەو ڕێکخراوە دەڕوانن و بە ڕێکخراوی خۆیانی دەزانن. بۆ نموونە گەنجێکی کورد ڕەنگە هەواداری ڕێکخراوی چریکە فیدایيەکانی خەڵک بێت بەڵام لە هەمبەر ئەو ڕێکخراوەش 'ڕێکخراوی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستان' کە زیاتر مۆرکێکی نەتەوەییانەی هەیە، هاودڵی نیشان دەدات. یان دێنشینێکی ناوچەی مهاباد هەرچەندەی کە بە شێوەیەکی نەریتیانە سەر بە حیزبی دیموکراتە بەڵام ڕێکخراوی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانیشی خۆش دەوێت. کەچی کاتێک لێیان دەپرسی: بۆچی ئەو ڕێکخراوە خۆی بە ئاشکرا ڕاناگەیەنێت؟ لە وەڵامدا کەمێک دەوەستن و دەڵێن: (دیارە ئەوە بەباش نازانن).

کاتێک پێیان دەڵێیت ئەمە لەبەر چیە و هۆکارەکەی چییە کە ڕێکخراوەکە ئاشکرا ناکەن؟ وەڵامی وات دەدەنەوە، هەرگیز دڵت ئاو ناخواتەوە.

کاتێک زیاتر لە کوردستان دەمێنیەوە و لەم و لەو دەپرسی دواجار لای خۆت دەڵێیت، ئەم ڕێکخراوە وەک ئەوەی پێویست بێت خۆی نەگرتووە و ڕەگاژۆ نەبووە و هێزێکی ئەوتۆی نییە، بەڵام سەبارەت بە ڕاستگۆیی و ئەو پێداگرییە لەکارکردن و ئەو پشتیوانییەی خەڵکی ناوچەکە لێی دەکات گومانێک نامێنێتەوە.

بە هەرحاڵ خەڵکی ناوچەکە پێیان خۆشە بڵێن کە کەسانی سەر بەو ڕێکخراوە دەستیان لە پێکهێنان و ڕێکخستنی ئەو یەکێتیانە هەبووە. پاشان زیاتر لەگەڵ ئەو ڕێکخراوە ئاشنا دەبین

***

# لەگەڵ یەکێک لە ئەندامانی حیزبی دیموکراتدا دەدوێم

لە سنە سەرێکم لە بارەگای حیزبی دیموکرات دا و لەوێ لەگەڵ یەکێک لە بەرپرسەکانیان کە دەتوانم بڵێم هەمەکارە بوو، قسەم کرد. ئێمە قسەی زۆرمان لە بارەی کوردستانەوە لەگەڵ یەکدی کرد و ئەویش هەم بۆچوونی تایبەتی خۆی و هەم هی حیزبەکەی بۆ باس کردم، بەڵام بڕیاردرا من تەنێ هەندێ بەش لە قسەکانی ئەو بەهەند وەربگرم و قسەکانی دیکەی بەلاوە بنێم. بەشێک لە قسەکانی بەم شێوەیە بوو:

'ئێمە ئۆتۆنۆمیمان لە چوارچێوەی ئێراندا دەوێت'

'ئەو ڕەوش و کەشوهەوا سیاسییەی ڕژێم دژی گەلی کورد و ئەو پڕوپاگەندەیەی وەڕێیخستووە کە گوایە ئێمە جوداخوازین، دەمانەوێ ئەو پڕوپاگەندەیە بڕەوێنینەوە.'

'ئێمە شتێک بە ناوی یەکێتیی جووتیاران لە کوردستاندا ناناسین'

'دەوڵەت ناتوانێت لە ڕێی ئاسمانییەوە لێمان بدات، یانی ئەو کارە ناکات.'

'خەبات درێژەی هەیە، بەڵام لەم ڕەوشەی ئێستادا ناتوانین دیدگای خۆمان بخەینەڕوو کە داخۆ ئێمە چۆن و بە چ شێوەیەک دەبێ خەبات بکەین، بەڵکو واپێویست بکات شێوازێکی توند و

تیژانەتر بگرینەبەر، بەڵام بەدڵنیاییەوە ئێمە دەستپێشخەر نابین، ئێمە تەنها بەرگری دەکەین و ئەگەر ناچار بین وەڵام دەدەینەوە.'

'ناتواندرێت متمانە بەم حکومەتەی ئێستا بکرێت.'

'ئێمە ڕۆژ بە ڕۆژ لەم حکومەتە نائومێدتر دەبین."

"بابەتێکی گرنگ هەیە کە ئێمە سوننین و باوەڕمان بە (ئیمامەت[1]) نییە. کەوابوو دەسەڵاتی پیاوانی ئاینی لە دەوڵەتدا، کێشە و گرفت بۆ ئێمە دروست دەکەن.'

'ئێمە باوەڕمان بە لاوازکردنی دەوڵەت نییە.'

'موفتی زادە، هەڵەی زۆری کرد و ئەم هەڵانە بوونە مایەی ئەوەی کە خەڵک ڕای لەسەر بگۆڕێت.'

'شێخ عیزەدین تەنیا پیاوێکی ئاینییە و پێشنوێژکەری مهابادە، ئایا کەسێکی ئاینی دەتوانێت ڕێبەرێتیی ناوچەیەک بگرێتە ئەستۆ؟'

'چریکەکان؟، زانیاریم نییە، ئێمە لێرە شتێکمان نیە بە ناوی (چریکە فیداییەکان) هیچ پەیوەندیمان بە ڕێکخراوەکەیانەوە نییە.'

'ئا بەڵی ئەو شتەی تۆ دەیڵێیت ئێمە لێرە نا، بەڵام لە مهاباد چالاکی و جموجۆڵی هەوادارەکانی ئەوان نادیدە دەگرین و چاوپۆشیان لێدەکەین."[2]

---

[1]-لای شیعەکان دوازدە پێشەوای ئاینی هەن کە ئەوان بە ئیمام ناویان دەبەن و هەر بۆیەش پێیان دەڵێن دوازدە ئیمامی. ئەو سیستەمە حوکمڕانییەش کە لە نێو جیهانی ئیسلامدا بە ولایەتی فەقیە دەناسرێت هەر ئەوەیە کە لەلایەن زۆر ئیسلامی سوننە ڕەت دەکرێتەوە .

[2]-نەمدەویست گوێ بدەمە ئەو قسەیەی ئەو بەرپرسە، بەڵام دواتر گوتم باسکردنی لە باسنەکردنی باشترە.. بەرپرسەکەی حیزبی دیموکرات گوتی:تەنیا کارێکی باش کە چریکەکان دەیکەن و بەلای ئێمەشەوە پەسندەو بەکەڵکمان دێت، بڵاوکردنەوەی بڵاوکراوەی هەواڵەکانی ئەوانە کە بەباشی لە کاتوساتی خۆی دەگاتە دەستی خەلک و ئێمە بە بڵاوکراوە

'دەرەبەگایەتی بەو شێوەیە لە کوردستاندا نییە'

'وەرزێرانی کوردستان ستەمی زیاتریان چەشتوە، چ لە ڕووی فەرهەنگی و چ لە ڕووی ئابووریدا سیستمی کشتوکاڵی هەمان سیستەمی سەدەکانی ناوەڕاستە.'

'حیزبی دیموکرات لە بەشی باکووری کوردستان[1] دەسەڵاتی هەیە سەدی نەوەدی خەڵکی گرێدراوی حیزبن.'

'قیادە موەقەتە؟ بە داخەوە کێشەیەکی ئاڵۆزە، ئەوان براکانی ئێمەن، پەنابەرن لێرە، زوڵم و ستەمیان لێکراوە و ئێمە بە هیچ شێوەیەک ڕێگەیان پێنادەین و ئامادە نین کە دەست لە کاروباری کوردستان وەربدەن، ئەوان هەر میوانی ئێمەن، ئەوەندە و بەس.'

***

---

هەواڵێکی زۆر ورد و راستی.... پەراوێزی نووسەر.

٢-مەبەست لە مهابادەوە بەرەو سەرەوە بۆ ورمێ تا سەلماس و خوی و ماکۆ.

## قیادە موەقەتەکان چ کەسانێکن؟ و چۆن کەڵکیان لێوەردەگرن و بەکاریان دێنن؟

ئەو قیادە موەقەتیانە خەریکن هێواش هێواش خۆیان دەردەخەن. مەریوانییەکان ئەوانە بە بەکرێگیراوی دەوڵەتی ئێستا دەزانن، هەروەک چۆن پێشتر بەکرێگیراوی دەوڵەتی شا بوون. حیزبی دیموکراتیش ئەوان بە میوان دەزانێت، هەڵبەت وەک دەوڵەتیش ئاوا ناویان دەهێنێت، بەڵام بەڕاستی ئەو قیادە موەقەتیانە چ کەسانێکن؟

بێگومان هەموو ئەو یاریانە بەفیتی ئیمپریالیزم و لەسەرووشیانەوە ئیمپریالیزمی ئەمریکاوەیە. ساڵی ١٩٧٢[١] کە ئەوکات ڕەوشی ئابووری و سیاسیی دەوڵەتی عێراق خراپە. ئەمریکا کاتێک ڕەوشی عێراق ئاوا نالەبار دەبینێت، بە یارمەتی سوپای شاهنشایی کە لەژێر ڕکێف و دەسەڵاتی خۆیدایە، شەڕێک لەنێوان عێراق و ئێراندا درووست دەکات، شا کە بەکرێگیراوی ئامریکایە، مەلا مستەفا بارزانی کە وەک گلۆلەیەک کەوتە ژێر پێی ئامریکا، بەهێز دەکات و بەریدەداتە گیانی حکومەتی عێراق، تاکو بەرەی یەکگرتووی عەرەبەکان دژی ئیسرائیل لاواز بکات و دواجار ئامریکا لە ساڵی ١٩٧٥ دەوڵەتی

---

[١]- پێموایە مەبەستی نووسەر ساڵی ١٩٧٤ بێت کە شەڕ لە نێوان کورد و حکومەتی عێراقدا هەڵگیرسایەوە.

عێراق ناچار دەكات لەگەڵ ئێران ڕێككەوتننامەیەک ئیمزا بكات كە خواستەكانی دەوڵەتی ئێرانی تێدا بەرجەستە و جێگیركرابێت كە لەهەمان كاتدا خواستی ئامریكایە. ئەو ڕێككەوتننامەیە لە لایەن شای ئێران و سەدام حوسێن لە جەزائیر واژۆ دەكرێت، كە ئاكامەكەی بریتی دەبێت لە ماڵوێرانی كورد و بەم شێوەیە خیانەتێكی دیكەی مەلا مستەفای بارزانی ئاشكرا دەبێت. مەلا لەپەنای شادا دەچێتە (عەزیمیەی كەرەج) و سەدان هەزار ئاوارەی كورد لە شوێنە هەرە دوورەدەستەكانی ئێران و دوور لە كوردستان پەرش و پەراگەندە دەكرێن.

بارزانی و خیانەتەكانی لە هەموو جێگایەكدا وێردی سەر زارانە، ئەو وەكو هەویر وابوو لە دەستی سیاسەتمەدارانی ئامریكا. ئەویان سەردەمێک كردۆتە داردەست و بە قازانجی ئیسرائیل دژی عەرەب بەكاریان هێناوە، سەردەمێک لەبەرژەوەندیی دەسكەوتەكانی ئامریكا بە پشتیوانیی شا دژی كوردەكانی ئێران بەكاری دێنن، سەردەمێک بۆ مانەوەی حكومەتی سەدام حوسێن دژی خەباتگێرانی عێراق بەكاری دێننەوە و سەردەمێكیش كوتكەكە دەدەنەوە دەستی خۆی تا ئەوەندەی گیانی بە بەرەوە ماوە بەسەری خۆی و گەلەكەی خۆیدا بدات، بارزانی هاوكاریی ساواک دەكات، نۆكەری (میت)[1]ی توركیایە، ملكەچی مۆسادی ئیسرائیلە و دواجار كوشندەترین زەبریش لە خەڵكەكەی خۆی دەدات و ئاوارە و دەربەدەریان دەكات، خۆی و خێزانەكەی دێنێتە عەزیمیەی كەرەج و خەڵكەكەش لەگوند و لادێ دوورەدەست و لاپەڕگەكانی ئێران بە فرۆشتنی بنێشت و كرێكاری و بە برسێتی ژیانێكی كۆلەمەرگی دەبەنەسەر. تا ئەوكاتەی خەڵكی ئێران

[1] – میت كورتكراوەی وشەی (Milli Istahbarat Teshkilati)ە.

ڕادەپەڕێ و شۆڕش دەست پێدەکات، دەرباری محەمەدڕەزا شا مانگانەیەک دەداتە کوردە پەنابەرەکان. بە سەرهەڵدانی شۆڕشی ئێران ئەو مانگانەیە دەبڕدرێت، کاریش ئیدی دەست ناکەوێت، خەڵکی پەنابەری کورد هەر چۆنێک بێت لەگەڵ ئەو ژیانە کۆلەمەرگیە ڕێدەکەن، لەلایەکی دیکەوە کوڕەکانی بارزانی (مەسعود و ئیدریس) بە فەرمانی ئاغاکانیان خۆیان ئامادە دەکەن کە دوای مردنی باوکیان، دیسان لەسەر تاوانکارییەکانی خۆیان بەردەوام بن و کرێگرتەیی خۆیان بۆ ئیمپریالیزم درێژە پێبدەن. بەمشێوەیە بەفەرمان و خواستی ئاغاکەیان شتێک بە ناوی (قیادەی موەقەتە- سەرکردایەتیی کاتی-) درووست دەکەن. شۆڕشی ئێران هەر وەک بینیمان ناتەواو مایەوە، کوردەکانی ئێران درێخی ناکەن، درێژە بە شۆڕش دەدەن و داوای ئۆتۆنۆمی و مافی خۆیان دەکەن. حکومەتی قوم کە نیاز و ناواخنەکەی ئاشکرایە و وابەستەبوونەکەی ڕۆژ بە ڕۆژ باشتر دەردەکەوێت و پیاوە گرێدراوەکانی ئیمپریالیزمی ئامریکا وەکو مانگای نێوچاوان بەش لەنێو ئەندامانی حکومەتەکەدا دیارن، دەکەونە گیانی خەڵکی کورد و هەوڵ دەدەن کە بەرژەوەندییەکانی ئاغاکەیان کە بە دواکەوتوویی هێشتنەوەی کوردستانی(ئێران- عێراق- تورکیا)یە هەروا بمێنێتەوە، بۆیە هەر دەنگێکی ئازادیخوازانە لە ناوچەکە هەراسانیان دەکات و هەوڵ دەدەن بیخنکێنن. کەسانی دیکەی برسی و ڕووت و ڕەجاڵ بە ناوی سوپای پاسداران لە تاران و قوم و شوێنەکانی دیکەوە دێنن و بەریاندەدەنە گیانی کورد، جەندرمەکان دەنێرنە ناوچەکە تاکو دەنگی ئازادیخوازانەی خەڵکی کپ و سەرکوت بکەن، بەڵام خەڵکەکە بەرگری دەکات و دەڵێت ئەگەر خواش لە ئاسمانەوە بێتە خوار، ئیدی ئێمە جەندرمەی ئێرانمان ناوێت. دەوڵەت پێداگری دەکات، گەلی کورد ملکەچ ناکات، دەوڵەت دەست بە

پەلامار دەکات و گەلی کوردیش وەلامی دەمشکێن دەداتەوە، دەوڵەت پاسدارەکانی دەکشێنێتەوە.

هەموو هێزری دەوڵەت ئەوەیە کە ناوەندەکانی هێز لە کوردستان بگرێتە دەست. بۆیە دەیەوێت بنکە و پاسگاکان دووبارە پڕبکاتەوە لەجەندرمە. کورد هاواری لێ هەڵدەستێت، دەوڵەت پاشەکشە دەکات، دیسان پاسدارەکان ڕەوانە دەکات، دەنگی کورد دیسان بەرز دەبێتەوە:

(سەیر گیرمان خواردووە، مەگەر ئێمە خۆمان ناتوانین شارەکانی خۆمان بەڕێوە ببەین کە ئێوە لە تارانەوە پاسدارمان بۆ دەنێرن! ئێمە خۆمان گەنجەکانی خۆمان ڕێک دەخەین کە پاسەوانی لە شار و سنوورەکان بکەن، مەگەر ئێمەش ئێرانی نین کە متمانەمان پێ ناکەن و بەهایەکمان بۆ دانانێن، بەلام ئیمپریالیزم نایەوێت کە گەلی کورد دەستی بە چەکەوە بێت، نایەوێت ئەو خۆی خاوەنداری کاروباری خۆی بێت، گەرەکیەتی کوردستان هەر بە دواکەوتوویی بمێنێتەوە تاوەکو بە ئاسانی بتوانێت لەوێ بارزانییەکان بە ئاسانی بخاتەوە سەرپێ. کەواتە ئێستا ئیمپریالیزم نایەوێت کورد دەنگی هەبێت، بۆیە ڕاستەوخۆ فەرمان بە داردەستەکانی خۆی لەنێو دەوڵەت دەدات کە هەر چۆنێک بێت دەبێ چەک لەدەستی کورد دەربهێندرێت. مەگەر دەکرێت کوردی ئێران چەکی بە دەستەوە بێت، سبەی نۆرەی کوردی عێراق و ڕۆژێکی دیکە نۆرەی کوردی تورکی و ڕۆژی دواتر کوردی سوریاش دێت...)

بەم پێیە دەوڵەت بە خێرایی دەکەوێتە خۆ و بە کورد دەڵێت:

(زۆرباشە مەگەر ئێوە ناتانەوێت کە پاسدارەکانتان لەخۆتان بن، ئێمەش ئەوە قبوڵ دەکەین.)

دەوڵەت دێت هەموو ناوچە کوردنشینەکان (هەر لە ڕۆژئاوای سنەوە بگرە هەتا ئەودیوی ورمێ) دەکاتە سێ بەش و لەیەک

کاتدا سێ بوونەوەری سەیروسەمەرە لە کیسەی ئیمپریالیزم دێنێتە دەرێ. بوونەوەری یەکەم کەسێکی بەدبەخت و کڵۆڵە بە ناوی موفتیزادە، کە مایەی نەفرەتی هەموو گەلی کوردە، دەولەت ناوی لێناوە (عەللامە) و حەوت سەد-هەشت سەد کەسی بێچارە و برسی و بێکار و چەقۆکێش و گەجەروگوجەری لە دەوری خۆی کۆکردۆتەوە و مانگی هەزارو حەوتسەد -هەشت سەد تومەنیان دەداتێ و بەناوی پارێزەرانی کۆماری ئیسلامی ئێران لە سنەوە تا سەردەشت جێگیری کردوون کە پاسەوانی بکەن و دژی کورد بوەستنەوە.

بوونەوەری دووەم شتێکە بەناوی (قیادەی موەقەتە) کە باسمان کرد بە چ شێوەیەک دروست کرا، ئیمپریالیزم وای بە باش دەزانی کە دەولەتی کۆماری ئیسلامی ئێران لەگەڵ ئەو قیادە موەقەتەیەدا کە کوڕانی بارزانی خۆفرۆشن، رێک بکەون و جارێکی دیکە وەک داردەست دژی خەڵکی ئازادیخواز کەڵکیان لێ وەربگیرێت، دانوستان سەردەگرێت و ئیدریس و مەسعود بارزانی پەنابەرە برسییەکان کۆدەکەنەوە، دیسان 'نەفرەت لەو پارەیە' بە مانگانەیەکی چەور رەوانەی کوردستانیان دەکەنەوە تا لە سەردەشتەوە هەتا پیرانشار ئەو سنوورەیان پێ بپارێزن. گەلی کورد تووڕە و دەهەری دەبێت، بەڵام دەولەت وەڵام دەداتەوە:

(ئەرێ پێمناڵێن ئیدی چە دەرئێکتانە! ئەمانە خۆ جلوبەرگیان کوردییە، زمانیشیان کوردییە، خۆ ئەمانەشمان لە تارانەوە نەناردوون، براکانی خۆتانن.)

بەمشێوەیە کوردی برسی و ڕووت و ڕەجاڵی ئەودیو دیسان بوونەوە مەقاشی دەست، بەڵام ئەمجارە بوونە مەقاشی دەستی کەسانێک کە دەیانەوێت حکومەتی عەلی دابمەزرێنن.

دەمێنێتەوە ناوچەی سێیەم واتە لە پیرانشار بۆ سەرەوە

(باکووری کوردستان له ڕووی نەخشەی کۆلۆنیالیزم هەمان شارەکانی (ئازەربایجانی ڕۆژئاوا) کە بریتین لە ورمێ، دێهاتەکانی دەوروبەری خوێ، سەڵماس، هەرێمی برادۆست و....)

لێرەشدا بوونەوەرێکی سەیروسەمەرەی دیکە بە ناوی (حەسەنی[1] یان ئاخوند حەسەنی، یان ئایەتوڵڵا حەسەنی هەر ناوێکی لێ بنێین، دێنن و سەرکردایەتی کۆمیتەکانی ورمێ دەگرێتە دەست، کە هەڵبەت پیاوەکانی ئەو ئاخوندە کۆنەپەرستە لە شارەکانی نەغەدە، پیرانشار، سەردەشت بەتایبەت لەسەربازگەی جەڵدیان لەگەڵ 'قیادەی موەقەتە'ییەکاندا دەبیندرێن.

بەمشێوەیە نەخشەی ئیمپریالیزم بۆ کپکردنی کاتیی دەنگی گەلی کورد پیادە دەکرێت. کەوایە ئێستا قیادە موەقەتەمان ناسی، ئەمانە کرێگرتەی ئیمپریالیزمن کە دەوڵەتی ئێران هەوڵ دەدات و دەیەوێت بە خەڵکی کورد بڵێت ئەمانە براکانی خۆتانن و میوانی ئێمەن و خەرجییەکانیشیان لە(بەیتولمال)، بە قەولی ئەو کوردە مەریوانییەی کە دەیگوت: ئەو بەیتولمالەی بە زێڕی ژنەکانمان کە تالانیان کرد و بردیانە قوم، دابین دەکرێت.

****

---

١-غولامرەزا حەسەنی١٩٢٧-٢٠١٨لە دایکبووی بوزورگ ئابادی ورمێ، تورکێکی دژی کورد و یەکێک لە دڵسۆزەکانی خومەینی و هەر لەگەڵ شۆڕشی خەڵکی ئێران کرا ئەو لە لایەن خومەینییەوە کرایە بەرپرسی کۆمیتەکانی شۆڕش و لە ماوەی بەردرێژی دەسەڵاتداریی خۆیدا زۆر تاوانی بەرامبەر بە خەڵکی کوردستان ئەنجام دا، یەکێک لەوان کۆمەڵکوژیی گوندی قارنەی ناوچەی نەغەدە و هەروەها شەڕی داسەپێندراوی نێوان کورد و ئازەرییەکانی شاری نەغەدە.

## خەڵک دەڵێن بانەیان بۆمبباران کردووە، بەڵام بابەتەکە شتێکی دیکەیە

کاتژمێر نزیکەی ٦ی دوانیوەڕۆ بوو، لە هوتێلەکە ڕاکشابووم و خەریکی خوێندنەوەی ڕۆژنامە بووم، پەنجەرە کراوە بوو، لە پڕ گوێم لە دەنگی بڵندگۆ بوو لە شەقامەکە بە کوردی شتگەلێکی دەگوت کە تاڕادەیەک تێیگەیشتم، دەیگوت:

-هاوڵاتیانی سنە بە هانای خەڵکی بانەوە بچن.

لەسەر تەختە خەوەکەم ڕاست بوومەوە و خۆم گەیاندە لای خاوەن هوتێلەکە.

"کاکە چ باسە؟"

"نازانم کاکە گیان، بانەیان بۆمبباران کردووە."

جانتاکەمم هەڵگرت و بە ڕاکردن بەرەو لای پاسەکانی سەقز ڕامکرد کە لەوێوە بچمە بانە.

دڵم بەو کارەی خۆم خۆش نەبوو، نەمدەویست بە دوای ڕووداوەکاندا ڕابکەم، بەڵام هیچ کارێکی دیکەم لە دەست نەدەهات، هەوڵمدا زۆر بیر لەو هەنگاوەی خۆم نەکەمەوە و بەهەر شێوەیەک بێت ناوی نەنێم سەرکێشی. سواری پاس بووم و وەڕێ کەوتم. لە ڕیزی یەکەمدا پیرەمێردێک دانیشتبوو، لێم پرسی:

"خاڵۆ لە بانە چ باسە؟"

"بۆمببارانیان کردووە."

"خاڵۆ، کەی بۆمببارانیان کردووە، بۆچی بۆمببارانیان

کردووه؟"

به تووڕەییەوە گوتی:

"خامینی، خامینی[1]، ئەو بۆمببارانی کردووە. ئەو موسڵمانی ناوێت، ئەو یەهوودی دەوێت، ئەرمەنی دەوێت، موسڵمانی ناوێت. دەڵێت سوننە موسڵمان نییە. هەر شیعە موسڵمانە. هەر شیعە و شیعە."

کەمێک بێدەنگ دەبێت، پاشان دەڵێت: "دونیا دەسووڕێت، ئەمڕۆ ڕۆژ ڕۆژی ئەوانە، دونیا دەگۆڕێت، ڕۆژگاریش هەروا نامێنێتەوە، تا ئێستا ڕۆژ هەر ڕۆژی فارسەکان بووە."

نەفرەت لە گۆڕی ئەو ئامریکایە کە چ بەزمێکی ناوەتەوە، کورد، فارس، شیعە، سوننە. ئەو مرۆڤە چەند نەگریسە، چەند هەلپەرستە تا داشی سوار دەبێت و دەیەوێت سواری ملی خەڵکی دیکە ببێت. هەموو لایەک نیگەرانە، کەس نازانێت چی ڕوویداوە، ڕادیۆی کوردستان پەیتا پەیتا داوای کۆمەک و یارمەتی بڵاودەکاتەوە.

چەند گەنجێکی کورد کە بە شێوە و سیمایانەوە دیارە خوێندەوارن، دەیانەوێت شتی زیاتر بزانن. بەردەوام پرسیار لە ڕێبواران دەکەن. یەکێک دەڵێت:

'بۆمب نەبووە، بنەتەقەی دژە تانک بووە، ٢٠٠ کەسی کوشتووە و بریندار کردووە، ڕەنگ بێت بە مەبەست نەبووبێت.'

ڕێبوارەکان بێ ئەوەی بەباشی ئاگاداری بابەتەکە بن و بە تەواوی شتێکی لێ بزانن، یەکسەر دەکەونە جنێو و تووک و نەفرەت. یەکێک دەڵێت:

'بە مەبەست و پلان بووە، فەرمانەکە لە قومەوە هاتووە،

[1]-مەبەستی خاڵۆی ڕێبوار، خومەنییە، نووسەریش هەر وەک ئەو، لە جیاتی خومەینی نووسیویە خامینی.

مسۆگەر بە مەبەست بووە.'

هەموویان تووڕەن، حوکمەکە دراوە، فەرمانەکە لە قومەوە هاتووە. من زۆر هەوڵ دەدەم داوەری نەکەم. ڕەوشەکە دەتخاتە ژێر پاڵەپەستۆ. ناتوانم بەڵگەیەک بدۆزمەوە، بەلام ئەوان پێویستیان بە بەڵگە و مەڵگە نییە، بریندارن. هۆکاری ئەو ڕک و نەفرەتەیان بەرامبەر قوم ئاشکرایە. هەر بڵێی بە چییەوە دەزانن کاری قومە؟ یەکسەر وەلامت دەدەنەوە: 'بۆچی جەژنی خوێناویی سنەتان لە بیر چووە، مەگەر نەغەدەتان بەبیر نەماوە.' من کە زانیارییێکی زۆرم نییە، ناچار دەبم دەمم دادەخەم و بێدەنگ دەبم.

تازە ئەمشەو هیچ، ناتوانین بزانین داخۆ لە بانە چ قەوماوە، چونکە کە گەیشتینە سەقز ئیدی ماشینێک دەست نەکەوت تا بچینە بانە. سبەینێ کێشەکە چارەسەر دەبێت.

پاسەکە کاتژمێرێکە وەڕێکەوتووە. لە ڕیزی دواوە دانیشتووم. چوار گەنجی کورد لە تەنیشتمەوە دانیشتوون. ماوەیەک کە تێپەڕی، بیرمکردەوە ئاوا بە بێدەنگی دانیشتن و خۆخەریککردن بە خوێندنەوەی ڕۆژنامە بە کەڵک نایە، وا باشە لەگەڵ ئەوانەی لە تەنیشتمەوەن قسە بکەم. دەکرێ ئەمانە بۆ زیاتر شارەزابوون و ناسینی کوردستان یارمەتیم بدەن. سەیرێکم کردن، چوار گەنجی زەحمەتکێش. پێم وابوو دێهاتیین و بە دڵنیاییەوە خوێندەواریشیان نییە و فارسیش هەر نازانن، چونکە دوو سێ جار وا ڕێکەوت قسەم لەگەڵدا بکەن هەر بە کوردی قسەیان لەگەڵدا دەکردم. لە کورسییەکەی پێشەوەشم کوڕێژگەیەکی دە دوازدە ساڵە دانیشتبوو. بیرم کردەوە تۆ بڵێی ئەمانە چ قسەیەکیان هەبێ پێم بڵێن، یاخود لەم نیوەی ڕێگایەدا قسەکردن لەگەڵ ئەمانە چ دەردێک دەرمان دەکات.

ئاوا لە هزران ڕاچووبووم، گەیشتینە شارۆچکەی دیواندەرە.

یەکێک لە گەنجەکان لە پاسەکە دابەزی و شتێکی کڕی و گەڕایەوە. ڕۆژنامەکەم کردەوە و لەبەر ڕووناکی کزی گلۆپەکانی پاسەکە سەرقاڵی خوێندنەوەی ڕۆژنامەکە بووم. ئیدی ئاگام لەوان نەما، تا ئەوکاتەی گەنجەکەی تەنیشتم بە کوردی شتێکی گوت و ڕووی تێکردم چنگێک مزرەسێوی وردیلەی بۆ لای من ڕاگرتن و گوتی: "فەرموو لێم وەربگرە."

سەیرێکی گەنجەکە و سەیرێکی سێوەکانم کرد و سەیرێکی گەنجەکانی دیکەم کرد، بە تامەزرۆییەوە قەپاڵیان لە سێوەکان دەدا. لەپی دەستی خۆمم کردەوە و سێوەکانی خستنە نێو دەستم. وەکو ئەوان بێ ئەوەی سەیر بکەم چی دەخۆم یەک دوای یەک سێوەکانم خوارد. ئەو مێرمنداڵەی لە پێش ئێمەش دانیشتبوو مژوڵی سێوخواردن بوو. سێوەکان بوونە پێشەکییەک تا سەری قسانیان لەگەڵدا بکەمەوە:

"فارسی دەزانی؟" بە یەکێکیانم گوت.

پێکەنی و ئاماژەی بە مێرمنداڵەکە کرد و بە کوردی شتێکی پێگوت. کوڕیژگە وەرسووڕا و لە سەر چیچکان دانیشت و پێیگوتم چی دەڵێیت.. دەیویست ببێتە وەرگێڕمان.

گوتم: "فارسی دەزانیت؟"

کوڕیژگە بۆی کردە کوردی و وەلامەکەی وەرگرتەوە، وەلامێکی ڕاشکاو:

"تۆ کوردی دەزانی! من فارسی نازانم و پێویستیشم پێی نییە."

خۆم کۆکردەوە. ئەمجارە ئەو پرسیارێکی لە من کرد و کوڕیژگە بۆی کردمە فارسی:

"تۆ لە کوردستان چی دەکەیت؟"

گوتم: "سەفەر دەکەم، دەمەوێت کوردستان ببینم، بیناسم."

" زانیاریت لە سەر ئەدەبیانی کورد هەیە، دەتەوێت بزانیت؟"

به هەڵەدا چووبووم، مسۆگەر ئەمانە گەنجی نەخوێندەواری گوندەکان نەبوون. گەنجانی لادێیی بوون کە بە دڵنیاییەوە زۆریان کار کردووە و زۆریان شت پێیە بۆ باسکردن، مایەی گاڵتەیە کە من پێم وایە چونکە فارسی نازانن، نەخوێندەوارن. بۆ دەبێ هەرکەسی فارسی نەزانێت نەخوێندەوار بێت! نەخێر وا نییە. دیارە بە زمانی کوردی خوێندەواریان هەیە و بە کوردی دەنووسن و دەخوێننەوە. ئاگاداری ئەدەبیاتی کوردین. ئەمە ئەو ستەمەیە لە گەلی کوردی دەکەن. گەلی کورد نابێ بە کوردی قسە بکات، نابێ بە کوردی بنووسێت، بخوێنێت. ئەگەر کتێبێکی کوردیت لێبگیرێ دەبێ بچیتە کونجی زیندان. کورد ئەگەر فارسی نەزانێت، کێوییە، هیچ نازانێت. منیش بەو تێڕوانینە سەیری هاوسەفەرەکەی خۆمم دەکرد.

وەڵامیم دایەوە: "نە هیچ لە بارەی ئەدەبیاتی کوردەوە نازانم."

بە پێکەنینەوە شتێک بە کوڕێژگەکە دەڵێت، کوڕێژگەش بە پێکەنینێکی زیاترەوە قسەکەی دەکاتە فارسی:

"من بازرگانم، بازرگانێکی ئەدەبیاتی کوردی، بازرگانی سیاسەت و خەباتی کوردی. بازرگانێک کە دەیەوێت پێ بە پێی خەباتگێڕانی دیکە، کە دەیانەوێت کورد ڕزگار بکەن. کوردی ئێران، عێراق، تورکیا و سوریا هەموویان یەکن و یەکیان بە بێ ئەوی دی هیچ واتایەک نادات. هێڵێکی گاڵتەجارانە بە ناوی سنوور ناتوانێت کورد دابەش بکات.،من بازرگانێکم کە هیچ شتێک بە ناوی سنوور ناناسم و دانی پێدانانێم"

پرسیم: "بازرگانیی چی دەکەیت کە دەتەوێت کورد ئازاد بکەیت؟"

گەنجە هەژدە ساڵییەکە ئاماژەی بە گونیەیەک کرد کە لە ژێر کورسییەکەی بوو و شتێکی گوت. ئەو گونیەم پێشتر بینیبوو، وامدەزانی ڕەنگ بێت ئارووی کڕیبن و بیانبات بۆ گوندەکان،

بەڵام کاتێک وەرگێڕەکە قسەکەی بۆ کردمە فارسی، نەخێر گونیەکە شتێکی دیکە دەرچوو.

"سەیری ئەم گونیەیە بکە ببینە، پێت وایە چی تیایە؟ ها! ئێستا پێت دەڵیم: کتێب، کتێبی کوردی، فیشەک، فیشەکی ڕووسی. کوردانی عێراق و تورکیا ئێستا ژێردەستەن، لە ژێر ستەم و فشار دان. ئەمڕۆ کە من بە بەراورد بەوان ئازادم، کتێبی سیاسی، ئەو کتێبانەی کە چارەسەری کێشە و ئازارەکانیان تێدا نووسراوە، لە هەموو کوردستان و لە لای دەستە و تاقمی نهێنی و لە لایەن هەموو هاوڕێیانی خەباتگێڕ وەریان دەگرم و کۆیان دەکەمەوە و دەیانخەمە نێو گونیە و دەیانبەمە گوندی، دەیانبەمە گوندی (زەڵێ)ی سەر سنوور. هەر شەو داهات وەکو ڕێوی کتێبەکان بە کۆڵیدا دەدەم، فیشەکەکان لە پشتم قایم دەکەم و بە نێو تاریکیدا خۆم بەو دیو سنووردا دەکەم، لەوێ هاوڕێیانی خەباتگێڕ لە شوێنی دیاریکراو چاوەڕێم دەکەن. لەوێ لەنێو ئەو کەشە ترسناک و تۆقێنەرە گەنجەکانی کورد تینووی فێربوونن. باوک و باپیرانمان تا ئێستا شەڕیان کردووە و خۆیان ڕاگرتووە، شەڕی زۆر بە هۆشیارییەکی کەم، بەڵام ئێمە گەنجانی کوردستانی ئێران، کوردستانی عێراق، کوردستانی تورکیا دەست دەخەینە نێو دەستی یەکدی و بە شەڕی زۆرتر و هۆشیاریی زیاترەوە دەچینە کۆڕی خەبات. لەو دیو سنوور گەنجانی کورد چاوەڕوانی من دەکەن، کتێب و فیشەکەکانیان دەدەمێ شەوی دواتر دەگەڕێمەوە ماڵەوە و ڕۆژی دواتر بە دوای کۆکردنەوەی کتێب و فیشەکی زیاتر دەکەومە خۆ. من بازرگانێکم کە کتێب و تفەنگ هەم دەتوانم هەرزان پەیدا بکەم و هەم هەرزانتر بیانفرۆشم. بە پێچەوانەی هەموو بازرگانەکانی دی."

کوڕێژگە وەرگێڕەکە ئیدی هیچی نەگوت، تا گەنجەکە خۆی

ڕووی تێکردم و بە کوردی هەندێ شتی گوت، ئێستا ئیدی واتای قسەکانی تێدەگەیشتم. زمان ئامرازێکە بە هۆیەوە دەبێت تێبگەیت لە دڵی کەسێک دا، لە بوونی هەر مرۆڤێکدا چی دەگوزەرێت. من ئێستا تێگەیشتبووم کە چی لە ناخی ئەودا دەگوزەرێت، بۆیە ئەو ئامرازە نەیدەتوانی ڕێگربێت لە بە لێکتێگەیشتنمان. ئەو دەیگوت:

(تا ساڵانێکیش پێش ئێستا گەنجانی کوردی عێراقی لەودیو سنوورەوە دەپەڕینەوە بۆ ئێران و چەکیان بۆ ئێمە دەهێنا، چونکە ئەوکات ڕەوشی ئێمە خراپتربوو و من لەنێو تاریکیدا چاوەڕوانی ئەوانم دەکرد، ئەمڕۆ ڕێوییەکەی ئەم بەرەی سنوور ئازادە، دەبینی ژیان ئاوایە، خەبات و تێکۆشانی بەردەوام.)

ئێستا ئیدی ئەو چوار گەنجە زەحمەتکێشە کە لە تەنیشتم دانیشتبوون، چوار گەنجی سادەی لادێی نەبوون و ئەو گونیەی کە لەژێر کورسیەکە بوو دەتگوت گیانی وەبەردا هاتووە و لەبەرچاوم جووڵەجووڵی بوو.

***

## بەرەو بانە دەڕۆین

ئەو شوێنەی پاسەکەی لێڕاوەستا ئەو شوێنە بوو کە بۆمبەکەی لێ تەقیبووەوە. ئێستا هۆکاری ڕووداوەکە ئاشکرابووە. بەڵێ بۆمبێکی بەهێز تەقیوەتەوە، بۆمباران نەبووە. ژمارەیەک کوژراو هەیە و شووشەی پەنجەرەکان تا مەودایەکی زۆر دوورتر شکاون. ڕووداوەکە بەو شێوەیە بووە کە کابرایەک بۆمبێکی قورمیشکراو بۆ فرۆشتن دێنێتە بازاڕ. یەکێکی دیکە ئامادەیە بۆمبەکەی لێبکڕێت، بەو مەرجەی شێوازی بەکارهێنانەکەشی پێبڵێت، بەمشێوەیە کابرای فرۆشیار دەست دەکات بە ڕوونکردنەوە و فێرکردنی کابراکە کە چۆن دەتەقێتەوە. کڕیارەکە چەند نارنجۆکێکی بە کەمەرەوە ئاوێزان کردوون. فرۆشیاریش ڕەختە و فیشەکی دیکەی لە خۆ ئاڵاندوون. لە کاتی ڕوونکردنەوە و فێرکردنەکە ڕووداوەکە دەقەومێ و بۆمبە قورمیشکراوەکە لەنێو دەستی هەردووکیاندا دەتەقێتەوە و ئەوان پارچە پارچە دەبن و لە هەمان کاتدا و لە چاوتروکانێکدا لە چیا و بەرزاییەکانی لای سەقز و بە دووری ٦٠ کیلۆمەتری بانە خەڵک هاوار دەکات و دەڵێت: (ئەی خەڵکینە سوپا دەستڕێژی لە خەڵکی بانە کردووە )، خەڵکی شار و شارۆچکەکانی دەوروبەر لە ماڵەکانیان دێنەدەر و هاوار دەکەن:

(خەڵکینە فڕۆکە بانەی بۆمباران کردووە.)

تیپەکانی پێشمەرکە لە شار و ناوچەکانی دەوروبەر بۆ بانە ڕادەکەن، بریندارەکان دەگەیەننە نەخۆشخانە. کوژراوەکان بە

خاک دەسپێرن و هۆکاری ڕووداوەکە باس دەکرێت، بەڵام کەس ئامادە نییە بەوە باوەڕ بکات، قسەکە یەکە بێ ئەملاو ئەولا، کاری دەوڵەتە و هیچ گومانێکی تێدا نییە. گەنجەکان کۆ دەبنەوە و پرسەکە هەڵدەسەنگێنن:

(دەبێ بزانین بۆمبەکە بە دەستی چ کەسێکەوە بووە)

(دەبێ بزانین چ جۆرە بۆمبێک بووە)

(دەبێ بزانین سوپای بەکرێگیراو نموونەی ئەو بۆمبەی هەیە یان نا)

(دەبێ بزانین لە چ سنوورێک تەقیوەتەوە)

(دەبێ بزانین چ کەسانێک کوژراون)

(دەبێ بزانین ....)

لێکۆڵینەوە دەکرێت، سەرەداوی سوپا و دەوڵەت لە ڕووداوەکە دەست ناکەوێت، دیسان دەست پێدەکەنەوە..

(ئێمە هەڵەیەکمان کردووە، کەمتەرخەمییێک هەیە.)

(شتێکمان پشتگوێ خستووە.)

(چۆن دەکرێت دەوڵەت لەم تەقینەوەیەدا دەستی نەبووبێت؟!)

(مەگەر مەریوان و سنە و نەغەدەتان لەبیر چووە؟)

گەنجەکان هێشتا خەریکی لێکۆڵینەوەن.

لەنێو شاردا پیاسە دەکەم، خەڵکەکە خۆیان بە گەنجەکانیانم دەناسێنن و زۆری پێناچێت کە لەگەڵ ژمارەیەکیان ئاشنا دەبم. ئێستا ئیدی زۆر نیگەران نیم، شتگەلێک لە بارەی کوردستانەوە تێگەیشتووم. دەتوانم لەگەڵ گەنجەکان لە بارەی ئەو شتانە قسەبکەم و دیسان شتی تازەیان لێ فێرببم و زیاتریان تێبگەم و لە بارەی ئەو کێشە و گرفتانەی کورد هەیەتی لێیان بپرسم، لە ڕەوشی گوندەکان دەپرسم، لەمەڕ چۆنیەتیی هێزەکان، لەسەر ڕەوشی شار. زۆر بە سادەیی دەڵێم هیچ شتێک نازانم، دەمەوێت زانیاری کۆبکەمەوە و تێیان بگەم، ئەوانیش قسەم بۆ

دەکەن و شتەکانم نیشان دەدەن. بەمشێوەیە تا ئەوەندەی دەتوانین زووتر لەگەڵ یەکدی ئاشنا دەبین و کێشەکان ئاسانتر چارەسەر دەبن.

ئێستا لەگەڵ خوێندکارێکی ڕشتەی پزیشکی ئاشنابووم، گەنجەکانی شار ڕێزی لێدەگرن. ئەو کوردستان وەک نەخۆشێک دەشوبهێنێ و بە هۆشیاری و چاویلکەی پزیشکێکی شارەزا ئەو خاڵانە دیاری دەکات کە ئێش و ئازاریان تێدایە. ئەو خاڵانەی کە دەبێت نەشتەرگەریان بۆ بکرێت نیشانم دەدات و باس لەو دەرمانانەش دەکات کە پێویستە بۆ نەخۆشییەکە بەکاریان بهێنن. تا نیوەڕۆ لەگەڵ کوڕەکان دام و ئەوان لە بارەی هەموو شتێک قسەم بۆ دەکەن. ئێستا من لەگەڵ هەموویاندا ئاشنام. زۆربەیان لەو گەنجانەن کە ساڵەهای ساڵ لە ژێر ئەشکەنجەی محەمەدڕەزا شای ناپاکدا تاڵاوی زیندانیان چەشتووە. کاتی نیوەڕۆ کە دەمەوێت بڕۆم، گەنجەکان دەیانەوێت لەگەڵ ئەواندا بچم، لەگەڵ ئەواندا دەچمە ماڵێک. لەوێ خواردن ئامادەیە. هەموویان لە دەوری خوانەکە دانیشتوون، بەڵام پزیشکی گەنج خەریکە تفەنگەکەی خاوێن دەکاتەوە، بە وردی پارچە و بەشەکانی یەک بە یەک هەڵدەوەشێنێتەوە و بە عشق و خولیاوە خاوێنیان دەکاتەوە، ئێمە لە خواردن بووینەتەوە، دکتۆر تفەنگەکەی ئەمنیەت دەدات و لە تەنیشت خۆیەوە بە دیوارەکەدا هەڵیدەنێ و دەست دەکات بە نان خواردن. لە کوردستان دەتوانیت لە گیرفانی هەر مێرمنداڵێکدا دەمانچەیەک ببینیت و ئەو بە سووک و ئاسانی وەک ئەوەی بەردێک هەڵبگری و لە شوشەیەکی بدەیت و بیشکێنی ئا بەو سادەییە تفەنگەکەی دەست دەداتێ و دوژمنەکەی تێک دەشکێنێت

***

## لەگەڵ دکتۆر سەرێک لە گوندەکان دەدەم و زۆر شتم بۆ ڕوون دەبێتەوە

دوای نیوەڕۆکەی لەگەڵ دکتۆردا بۆ سەردانی گوندەکان ڕێگای پڕ پێچ و گەوەمان بڕی و بەنێو گرد و تەپۆڵکەکاندا ڕۆیشتین. پێشمەرگەکانی حیزبی دیموکرات بە خۆیان و ئوتومبێلە سوپاییەکانییانەوە بە جادەکەدا دەڕۆیشتن و پارێزگاری ناوچەکەیان دەکرد. دکتۆر گوتی:

"ئەو حیزبە لێرە لەنێو ئەو گرد و تەپۆڵکانەدا لایەنگری زۆری هەیە، بەڵام هیچ کات بە شێوەیەکی تۆکمە و پرەنسیپی کار ناکات. ئەم وەرزێرانە لە ڕووی جەنگاوەری و ئازادییەتیەوە نموونەیان نییە، بەڵام حیزب هیچ بایەخێک بەو بابەتە نادات، تەنیا دەیەوێت ژمارەی ئەندامانی زیاتر بن. تۆ سەیریکە ئێستا دەبینی زیاتر لە پەنجا کەسیان لەو ئوتومبێلە ڕینۆ سوپاییە بار کردووە. ئایا ئەمە لە هیچ یاسایەکی سوپاییدا جێی دەبێتەوە. ئەگەر من دوژمن بم، لەو بەرزاییەوە دەتوانم بە بێ ئەوەی بتوانن دەست بکەنەوە هەموویان تەفروتونا بکەم. سەیرکە دەتواندرێت لەو گۆشەیەوە هەموویان بکرێنە ئامانج."

ئەو گۆشەیەکم نیشان دەدات. پێشمەرگەکان هێشتا ئاگایان لە هاتنی ئێمە نەبوو بۆ ناوچەکە. دکتۆر لوولەی تفەنگەکەی وەرسوڕاند و گوتی:

"دەبینی چەند ئاسان دەتوانی ئەو وەرزێرە بە هێزانە لەناو ببەیت. ئەمە خەتای حیزبە. ئەمە ترسناکە. هەرچەندی ڕەخنە لە

ڕێکخستنەکەیان دەگرین، هەرچەند تێبینیان دەدەینێ، گوێ ناگرن. ئەوانە دەیانەوێت کەسانی زیاتر ببنە ئەندامی حیزب، ئەگەرچی ئەوەش شتێکی پێویست نییە. دێهاتییەکان هەر لە خۆیانەوە بە هۆی ئەو خەباتگێڕە دڵسۆزانەی لەنێو ئەو حیزبەدا هەبوونە، ئەو حیزبەیان خۆشدەوێت، بەڵام سەرانی حیزب کەڵکی خراپ لەو لایەنگری و دڵسۆزییەی خەڵکەکە وەردەگرن."

دکتۆر بەردەوام دەبێت و دەڵێت:

"سەیرکە بەو هەموو دەرفەتەی کە هەیە و دەسکەوتێکی گرنگە، نابێت بەمشێوەیە ئەوانە ئاوا سواری ڕینۆی سوپایی بکەن و لەو ناوە مانۆڕیان پێ بکەن. دەتواندرێت بە ژمارەی کەمتریش مانۆڕ ئەنجام بدرێت. نابێ ئەو هەموو هێزە بە بێ کار و ئەرک بهێڵدرێتەوە. پێویستە لە ڕووی سیاسییەوە هۆشیار بکرێنەوە، بەڵام حیزب هیچ بایەخ بەو بوارە نادات. وەک بڵێی نەیەوێت ئەندامەکانی لە ڕووی سیاسییەوە هۆشیار ببنەوە، دەترسن ئەندامەکانی لە شتەکان بگەن. دەترسن کە ڕەگی ئێش و ئازارەکانیان نیشان بدەن. هەرچەندە ڕێبەرەکانیشیان هیچ بە تەنگ ئەوەوە نین، ئێش و ئازارەکانی خەڵک ببینن و دەستنیشانیان بکەن، بەڵام پێشمەرگە جەنگاوەرەکانی دیموکرات ئەوە نازانن. پێشمەرگەی دیموکرات وەک پەنجا ساڵ پێش ئێستا بیر دەکاتەوە، پێی وایە چارەسەر تەنیا هەر لوولەی تفەنگە، ئێستاش پێیوایە تەنیا و تەنیا هەر تفەنگ دەرمانی دەردەکانیان دەکات."

بە درێژایی ڕێگاکە جووتیارانم دەبینی خەریکی دروێنە بوون. ژنان دەسکەنەی نۆکیان دەکرد. منداڵان شان بە شانی ئەوانی دیکە کاریان دەکرد. دکتۆر جێپەکەی لە شوێنێک ڕاگرت و چووینە نێو کێڵگەیەک. دکتۆر گوتی:

"تۆ دەتوانی کاری خۆت بکەیت، منیش سەرێک لە

جووتیارەکان دەدەم."

بەنێو پەرێزە گەنمێکدا ڕۆیشت و چووە لای کەپرێکی سەپانان، ژمارەیەک پاڵەی لێ بوون. منیش لە شوێنێک لای چەند کەسێک کە خەریکی دروێنە بوون ڕاوەستام و لەبەر ئەوەی دەیانزانی هاوڕێی دکتۆرم، قسەم لەگەڵدا کردن. جووتیارێکی کورد کە ماڵەکەی لە سەر سنوور بوو بە فارسییێکی شڕ و شەپڕێو بە زەحمەت قسەی بۆ کردم و گوتی:

"ئەمە کارەکەمانە دەیبینی، ئەمە لە لایەک، من بۆ خۆم لە کاتی خۆیدا نوێژی خۆم دەکەم، بەڵام حکومەتێکم دەوێت بهێڵێ بە ئاسوودەیی بژیم و نانی خۆم بەدەست بێنم. بۆ من چ جیاوازییێکی هەیە کە شا بێت یان ئەوەی ئێستا، کاتێک من هەر برسی بم."

ئاماژەی بە دکتۆر کرد و گوتی:

"ئێمە ئەوانەمان قبوڵە، دەزانی بۆ، چونکە فێریان کردین هەر شتێک بە لایەکەوە بەڵام پرسی ژیان و بژێوی شتێکی دیکەیە. هەر ئەمانە ئێمەیان فێرکرد کە ئەگەر مان بگرین، ئەگەر یەکبگرین و کۆ ببینەوە دەتوانین توتنەکەمان گرانتر بفرۆشینە دەوڵەت. قوربان! ئێمە هەموو توتنکارەکان چووین و لە فەرمانگەی دەوڵەت دانیشتین و گوتمان، دەبێت توتنەکەمان گران بکڕن، قوربان ساڵانی پێشتر هەرچی خۆمان لە داروبەرد دەدا توتنەکەیان بە حەوت تومەن لێدەکڕین، بەڵام مانمان گرت، دەستمان خستە نێو دەستی یەک، کردیانە بیست تومەن، دەبینی کاکە ئەمە شتێکی دیکەیە، ئێمە دەبێ مان بگرین، بەڵام ئەو دەسەڵاتدارانەی دەوڵەت نیوەگیانمان دەکەن تا پاروە نانێک بۆ ماڵ و منداڵمان دەدەست دێنین." چەند گوڵە گەنمێکی چنین، دەنکە گەنمەکانی لەسەر لە پی دەستی نیشانی من دان، هەموویان ڕەش و کرمگرتوو بوون، بە خەمگینیەوە گوتی:

"دەبینی قوربان، ئێوە فارسەکان مرۆڤگەلی باش نین، حکومەتەکەش هی ئێوەیە، ئەم گەنمە پەین و دەرمانی پێویستە، دەرمانی دژە ئافات، بەڵام فەرمانگەی کشتوکاڵ نایدات دەڵێت: (کوردستان نائارامە، ئێمە ناتوانین بتاندەینێ) ئاخر قوربان کوا کوردستان نائارامە؟ من دەبێ چەند خۆم ماندوو بکەم و گیانم بێتە سەری لووتم تا ئەم گەنمە کرماوییە بەرهەم دێنم." ئەو دەستەی کە دەنکە گەنمەکانی لەسەر بوون و نیشانی منی دەدان لەرزی. ئێستا پیاوەکە هاواردەکات کە:

"لەبەر ئەوەیە کە ئۆتۆنۆمیمان دەوێت. کە ئۆتۆنۆمیمان وەرگرت، ئیدی کاتێک من زەحمەت بکێشم، ڕەنجی شانم ناچێتە گیرفانی فارسەکان. ئەمە کەی ڕەوایە، دەرمان بۆ فارس، جێگای خۆش بۆ فارس، ئاوی پاک، سینەما بۆ فارس، ئینجا دەبێت پارەی بەروبوومی خۆشم بە قیست بدەنێ. دەرمانیش هیچ، گەنمی ئێمە کرم لێی دەدا..."

دیسان ئاماژەی بە دکتۆر کرد: "ئەگەر ئەم دکتۆرە نەبێ منداڵەکەم دەمرێت، بەڵام دکتۆر چ بکات کە دەرمان نەبێت، دەرمانمان دەوێت، دکتۆری بێ دەرمان چی بکات."

دکتۆر بۆی باس دەکردم: "کێشەکانی ئەم ناوچەیە کێشە و ئازاری کۆمەڵایەتین، دەرد و ئازاری ناوچەیین. وەرزێر دەرفەتی نییە بە منداڵەکەی ڕابگات. هەر ئەو گوندەی خوارەوە لە دە ماڵ پازدە منداڵیان ڕەنگ زەرد و لە حاڵەتی مردندا بوون. چووین سەیرمان کرد، منداڵەکان گڵیان دەخوارد. هەشت ساڵە، دە ساڵە گڵ دەخۆن و کەس ناپرمێتە سەر ئەوەی چاوی لێیان بێت بایەخێکیان پێ بدات. بەدبەختی هەدادانی نییە. ڕێگاوبان نییە، لە گوندێکی بچووک کە لەبەر بێ ئاوی لە شیوێک دروست کراوە، چۆن دەتوانی نەخۆش بگەیەنیتە شار! بە کام ڕێگا و بەکام هۆکاری گواستنەوە! لێرە نابێت کەس نەخۆش بکەوێت، یان

دەبێت تا ماوە بە ئازارەوە بتلێتەوە یان هەرچی زووە بۆ خۆی بمرێت و ئاسوودە ببێت."
کابرای جووتیار دانە گەنمە چرچ و قلۆشەکانی لە سەر جۆخینێک ڕاکرد، دانەیەکیشی هەڵگرت و نیشانی منی دا و گوتی:
"ئەو کاتەی ڕژێمی حەمەڕەزا شا لە سەر حوکم بوو ئۆتۆنۆمیمان دەویست، ئێستا ئیدی ڕەوشی ئەو ئاشکرایە چۆنە، ئێمە لێرە کەسانی لێهاتوومان هەن کە هەرگیز دەست لە مافی کورد هەڵناگرن، ئێمە شەریفزادەکانمان هەبوون، مەلا ئاوارەکان و موعینییەکانمان هەبوون، هێشتاش هەر هەمانن.."
کاتێک بینیی من زۆر سەر لەو شتانە دەرناکەم و ئاشناییم لەگەڵیاندا نییە، سەری خۆی ڕاوەشاند و گوتی:
"ئێوەی فارس تەنیا خۆتان دەناسن، ئێمە کەسانێکمان هەیە کە تەنانەت نموونەیان لە نێو فارسانیشدا پەیدا نابێت، ئەوانە بە درێژایی تەمەنی خۆیان لە پێناوی ئازادیدا تێکۆشاون."
قسەکەی دکتۆرم هاتەوە یاد کە دەیگوت:
"ئێوە تەنیا خوێنەران و شاعیران و نووسەرانی تاران دەناسن. وەرن ببینن ئەم کوردانەی ئێمە چییان کردووە، لە بواری شیعرەوە چ بەزمێکیان ناوەتەوە. ئاوازەکانیانتان بیستووە؟ قەت شیعرەکانیانتان خوێندوونەتەوە؟ سروودەکانیان دەزانن؟ ئەرێ قانع دەناسن؟.."
هیچ وەڵامێک نەبوو بە دکتۆری بدەمەوە.
دکتۆر هێشتا خەریک بوو قسەی لەگەڵ وەرزێرەکاندا دەکرد. دڵنیام لە بارەی گرنگی یەکێتیی جووتیارەکان قسەی بۆ دەکردن، یان قسە بۆ نەخۆشێک دەکات کە ئەگەر دەرمان دەست نەکەوت قەی ناکات با پشوو بدات، پشوو بدات.
لە ڕێگا بە منی گوت: "هەر ئەوەیە، ئیدی پشوو بدات تا

دەمریت، یان هەر چۆنێک بێت بە دەرمانی گژوگیایی سکچوونەکەی ڕابگرێت."

بەیانی کە لە نێو شاردا پیاسەم دەکرد سەیرم کرد چەند دێهاتییێک لە دەوری شتێکدا کۆ بوونەتەوە. خۆم گەیاندە لایان، بینیم گەنجێکی ملەستووری سیستانی کەوڵوکاسی خۆی لەو ناوە ڕاخستووە و دەرمانی گژوگیای لەوێ داناوە و خەریکە دێهاتییەکان دەرمان دەکات. ژنێکی گەنج خۆی نیشانی پیاوەکەتەکە دا و گوتی: "هەناوم دەئێشن، هەرچی دەیخۆم دیهێنمەوە. گەدەم ترش دەکات."

کابرای سیستانی گوتی: "ئادەی زمانت دەربێنە ببینم."

ژنەکە زمانی دەرهێنا، ڕەش داگەڕابوو. پیاوەکە گوتی:

"چاکت دەکەمەوە، بەڵام دەکاتە سی تومەن."

ژنە داماوەکە ناڵاندی. ئاخر ئەو هەموو پارەیە!..."

کابرای سیستانی گوتی: "زۆر باشە، بیستوپێنج تومەن."

ژنە گەنجەکە لەبەر نەبوونی بیستوپێنج تومەن تەریق بووەوە. ئەو گەنجانەی دەوری پیاوە سیستانییەکەیان گرتبوو، زەق زەق سەیریان دەکرد، پیاوەکە کەمێک خۆی کۆکردەوە، سەیرێکی دەوروبەری کرد و گوتی:

"زۆر باشە تۆ پازدە تومەن بدە."

ڕوخساری گەنجەکان هێمن بووەوە. سیستانی چەند دەنکێکی تێکەڵ یەک کردن و گوتی:

"ئەمانە دەکوتی، دەیانکەیتە ڕۆن و بەر لەخەوتن دەیخۆیت، چوار شەو لەسەر یەک دەیخۆیت و چاک دەبیت."

ژنە گەنجەکە نزای کرد و دەرمانەکانی وەرگرت و ڕۆیشت.

گەنجێکی دیکەی دێهاتی هاتە پێش و خۆی نیشانی دەرمانفرۆشەکە دا و گوتی:

"سەرم گێژ دەخوات، گران دەبێت، ناتوانم دروێنە بکەم."

پیاوە سیستانییەکە ژێر نینۆکەکانی گوشین و چەند جارێک کێشای بە پشتی دەستی و پاشان سەیرێکی خەڵکەکەی کرد و گوتی: "پارەکەی دەکاتە پازدە تومەن."

بە جێپەکە بە ڕێگای نێو شاخەکاندا دەڕۆیشتین. دکتۆر دەیگوت:

"سەیرێکی ڕێگاکان بکە، ئەگەر سوپا بیەوێت لە ڕێگای زەوییەوە هێرش بێنێ و ڕووبەڕوو ببێتەوە، فاتیحای خوێندراوە. دێنشینەکانی ئێرە بە چاوبەستراوییەوە دەتوانن لەم گوزەرگایانەدا ڕووبەڕووی دوژمن ببنەوە."

ڕێگاکە ڕێگایەکی پێچاوپێچ و سەختە. کاتژمێرێک بەڕێوە بووین تاکو گەیشتینە گوندی 'بەردەڕەش'. دکتۆر جێپەکەی لە بەردەم دوکانی ئاسنگەریی پیرەمێردێک ڕاگرت و گوتی:

"با بچین سەرێک لەوێ بدەین. با ببینین بزانین داخۆ لە سەدەکانی ناوەڕاستیش بەو جۆرە ئامێرانە کاریان کردووە."

بینینی گوند و قسەکردن لەگەڵ دێنشینەکان ئاسوودەییەکت پێدەبەخشێت کە بە ئاسانی بە دەست نایەت. لە شار بە هەر کەسێکم دەگوت دەمەوێت بچمە گوند، بە نیگەرانییەوە دەیگوت:

"مەگەر شێت بوویت، چ کارێکت بە گوندە؟"

مانای ئەو قسەیە تێنەگەیشتم، لای خۆم دەمگوت ئەمە نیگەرانی بۆ چییە. مەگەر گوندەکانی دەوروبەری تاران یان دەوروبەری شیراز و ئەسفەهان و ئەو شوێنانە نەبوون کە بۆیان دەچوین، ئەمە ترسی تێدا نییە دەشچینە ئێرە، بەڵام کاتێک گوندەکانی کوردستانم بینی تێگەیشتم کە ئەوانە بۆچی نیگەرانن. ئەو گوندانە، بەتایبەت دێهاتەکانی دەوروبەری سنوور بە گشتی لە دە پازدە ماڵ پێکهاتوون کە لەسەر نشێوی دۆڵێک یان تەپۆڵکەیەکدا چێکراون. خانووی بچوک، بە سادەترین شێوازی بێسەروبەرانە و کۆن. لەو گوندانەدا شتێک بە ناوی دوکانی

بەقاڵی یان نانەواخانە، یان قەسابخانە و ئەو جۆرە شتانە بوونی نییە. چەند چواردیوارێکی قوڕوبەردیان پێکەوە ناوە، تەنیا بۆ ئەوەی سێبەرێکیان هەبێت یان کە باران باری لە خەویان نەکات. بە هەموو تەمەنیان کەسێکی لایدە نەگەیشتۆتە ئێرە. تەنیا دەکرێ بڵێین جەندرمە نموونە و پێناسەی فارسەکان بوون لای ئەوان. ئەمە پێناسەیەک بۆ ناسینی فارسەکان لای ئەوان، نموونەیەکی دیکە دەبێ ڕەگەکەی لە مێژوودا بدۆزینەوە. فارس بە درێژایی مێژوو لەژێر بەرگ و ڕوخساری جۆراوجۆردا فەرمانڕەواییان بەسەردا کردوون. ڕەزاخانی ملهوڕ لاوەکانیانی کوشتوون. ژنەکانیانی داوەتە دەستی جەندرمەکان. محەمەدڕەزا شای خۆفرۆش بەردەوام بۆ خەباتگێرانی کورد لە بۆسەدا بووە و ڕاوی کردوون و خستونیەتە کونجی ئەشکەنجەگاکان و حکومەتی ئێستاش، حکومەتێک کە بە قەولی ئەو دێهاتییە لە پاریس قسەی باشی دەکردن و ئێستاش لە قوم لێمان بۆتەوە ڕژێمی محەمەدڕەزا شا، دیسان وەکو جاران هەر کوردێکی ئازادیخواز دەنگی هەڵبڕێت لە خوێنیدا دەگەوزێنێ. ئاوا بووە کە کوردێکی دێنشین هیچ جیاوازیەکی لە نێوان خەڵک و حکومەتە یەک لە دوای یەکەکان نەبینیوە و حکومەتە زۆرداره فارسییەکان لە خەڵکە ئازارچەشتووەکەی دیکەی فارس جیاناکاتەوە. بۆ دەبێ دڵی بە فارسەکان خۆش بێت، بۆ دەبێ هێلێک نەکێشێ کە نەهێڵێت فارس قاچی بخاتە ئەمبەری هێڵەکە. ئەمە خواستی حکومەتە بەکرێگیراوەکانیشە کە ناکۆکی بخەنە نێو گەلان و وابکەن کە کوردێکی دێهاتی هێڵ بکێشێت و نەهێڵێ ئیدی فارس پێ بخاتەوە ئێرە. ئەمە یەکێک لە یارییە سادەکانی ئیمپریالیزمە کە دارێک بداتە دەستی کورد و گورزێکیش بداتە دەستی فارس کە سەر و گوێلاکی یەکدی پێ بکوتن تا گیانیان دەردەچێت و ئەو دەرفەتی هەڵلوشینی ڕەنج و ئارەقەی هەردووکیانی هەبێت.

فارس کاتێک دەگاتە ناوچە لادێییە دوورەدەستەکان، هەموو جوولە و هەڵسوکەوتێکی دەکەوێتە ژێر چاودێری و هەمووان یەکەم جار ئەو پرسیارە لەخۆیان دەکەن:
"پیاوی دەوڵەت نییە؟"
"خەریکی فرتوفێڵێک نییە؟"
"جاسووسی قوم نییە؟"
"زمانمان لێنادات؟"
دکتۆر دەیگوت: "ئەمانە بە چوارچاو سەیرت دەکەن. بەردەوام لێم دەپرسن ئەم فارسە چیدەوێت، پێیان دەڵێم کەسێکی باشە. دەیەوێت لە بارەی کوردەوە بنوسێت. ئەمە دۆستی کوردە کوردی خۆشدەوێت."
ئەوانە لەوەلامدا دەڵێن: "مەگەر فارسیش دەتوانێت کوردی خۆش بووێت!؟"
دکتۆریش وەلام دەداتەوە کە: "بەڵێ فارسی واش هەن کە کوردیان خۆش دەوێت. خەڵکانێکیش هەن کە چاویان بڕیوەتە سەرکەوتنی گەلی کورد، بەڵێ خەڵکانێک هەن چاویان لەسەر خەباتی کوردە و چاوەڕێن ببینن داخۆ گەلی کورد چی دەکات و چۆن دەگاتە ئامانجەکانی تا ئەوانیش بە شوێنی کورددا دەست بکەن بە خەبات و تێکۆشانی خۆیان.
***

## دەچینە گوندی
## (بەردە ڕەش) و لەوێ زارا دەبینین

کە گەیشتینە گوندی "بەردەڕەش" و سەرێکمان لە دوکانی ئاسنگەریی پیرەمێردەکە دا، چەند پیاوێکی گوندەکە هاتن و دکتۆرەکەیان لەگەڵ خۆیاندا برد. دکتۆرەکە منی بە مێردمنداڵێک سپارد. پیاوە ئاسنگەرەکە خەریکبوو داسی دروست دەکرد، کوورەیەکی بچوکی ئاسنگەری هەبوو کە ئاسنی تێدا سوور دەکردەوە، هەموو ئامێر و کەلوپەلی دوکانەکە برییتی بوو لە سندانێک و چەکوشێک و چەند پارچە ئاسنی ژەنگاوی. پرسیم ڕۆژانە چەند دانە داس دروست دەکەیت، داهاتت چەندە. دکتۆر پێی گوتبوو کە:

" ئەم میوانە کەسێکی خراپ نییە، ئاگات لێی بێت."

بۆیە ئاسنگەر سیغارێکی لە توتنی خۆیان پێچایەوە و دایە دەستم و گوتی: "(هەڵبەت فارسی نەدەزانی مێردمنداڵەکە بۆی دەکردمە فارسی) ڕێم بدە بۆت باس بکەم داهاتم چەندە. ڕێم بدە با بۆت ڕوون بکەمەوە."

دوکانەکەی لە پەڕگەی گردێک بوو. کەمێک نزیکتر لە دوکانەکە، دۆڵێکی قووڵ پڕ لە داربەڕوو، لە بەرانبەرمان دەمی کردبووەوە. ئاسنگەر داسەکەی خستە نێو کوورەی ئاگرەکە و گوتی:

"ڕۆژێک دوای چەندین ساڵ گوتم با سەرێک لەشار بدەم. دوکانەکەم داخست و کەوتمەڕێ، پیاسەیەکم بەنێو شاردا کرد.

له دوكانی سه‌رتاشێک بینیم كابرای سه‌رتاش ڕیشی پیاوێکی شاری ده‌تاشێت. پیاوه‌كه پارچه‌یه‌كی سپی پاک و خاوێنی خسته سه‌ر شان و ملی كابرا شارییه‌كه، به شتێک سابوونی له ڕوومه‌تی هه‌ڵسووی و كه‌فێكی زۆری كرد و جویزانه‌كه‌ی تیژ كرده‌وه و به ئه‌سپایی ڕیشی كابرای تاشی. حه‌زم چووێ كه ڕیشی منیش به‌و شێوه‌یه به‌و هه‌موو كه‌ف و به‌و جویزان و ئه‌و پارچه سپییه خاوێنه‌وه بتاشێت. لێی چوومه‌ژوور و له‌سه‌ر كورسییه‌كه‌ی به‌رانبه‌ر ئاوێنه دانیشتم، پارچه‌كه‌ی هه‌ڵدایه سه‌ر شان و گه‌ردنم و به سابوون و ئاوی گه‌رم ڕیشی كه‌فاوی كردم و ....

پیره‌مێرده‌كه ده‌ستی به ڕوومه‌تی داهێنا وه‌ک ئه‌وه‌ی هێشتاش گه‌رمی ئاو و سابوونه‌كه‌ی ئه‌و كاتی به‌سه‌ر پێستی ڕوومه‌تیدا هه‌ست پێبكات "پاشان ڕیشی تاشیم. به دڵخۆشیه‌وه هه‌ستامه‌وه و به ڕێزه‌وه تومه‌نێکم دانایه سه‌رمێزی سه‌رتاشخانه‌كه و ده‌سماڵه‌كه‌ی خۆمم هه‌ڵگرت كه بڕۆم. له‌پڕ كابرای سه‌رتاش هاواری لێهه‌ستا: (ئۆهۆی بۆ كوێ، پاره‌كه‌ت بده.) پیاوه ئاسنگه‌ره‌كه ئاره‌قه‌كه‌ی سڕیه‌وه. "گوتم به دڵنیاییه‌وه هه‌ڵه‌یه‌ک هه‌یه. تومه‌نێكم دانابووه سه‌ر مێزه‌كه‌ی. پیاوه ده‌لاكه‌كه ده‌ستی درێژكرد و گوتی بێنه بیده، مه‌گه‌ر ده‌ته‌وێت سه‌ده‌قه بكه‌یت، ته‌واوی كه، بێنه بیده. ته‌ریق بوومه‌وه تومه‌نێکی دیكه‌م داین. كابرای ده‌لاک تووڕه بوو گوتی: (پێت ده‌ڵێم بێنه بیده.) هه‌موو ئه‌و خه‌ڵكه سه‌یری ئێمه‌یان ده‌كرد، منیش تومه‌نێکی دیكه‌م دانا. به چی بزانم ده‌بێ چه‌ندی بده‌مێ. پاره‌كه زۆربوو، به خه‌مگینیه‌وه له دوكانه‌كه چوومه ده‌ر. ئه‌و كه‌سه‌ره به ساڵان له‌سه‌ر دڵم بوو. ئێستاش كه ڕیشم ده‌تاشم ئه‌و كابرا ده‌لاكه تڕزله و ئه‌و سابوونه گه‌رمه و ئه‌و سێ تومه‌نه‌م به‌بیر دێته‌وه...."

ئاسنگەری تایین کەمێک ڕاوەستا وئینجا گوتی: "دوای ئەو ساڵانە هێشتاش زیاتر لەو ڕۆژەی پێش ڕیشتاشینەکەی ئەوکاتم دەست ناکەوێت. زۆرم ئیش کردبێ پارەی دوو ڕیشتاشین و پاروە نانێکە." دەوروبەرەکەی نیشان دام و گوتی: "پێت وایە کێ بۆ ئیشی ئاسنگەری دێتە ئێرە؟ لەو ئاسنگەرییەش بترازێ کارێکی دیکەم پێناکرێ."

پشتی کۆم بوو بوو، هەر دوو چلەئێسقان بوو. سیغارەکەی کێشا، داسە سووربووەوەکەی لە کوورەکە دەرهێنا و گوتی: "ئێمە لێرە دووکەسین کە لە بەیانییەوە دێین تا خۆرئاوا دەبێ کاردەکەین."

کاتێک گوتی ئێمە دوو کەسین لێرە کار دەکەین، سەیرێکی دەوروبەرم کرد تا کەسی دووەم ببینم، بەڵام هیچ کەس دیار نەبوو. دووبارە داسەکەی خستەوە نێو کوورەکە و بانگی کەسێکی کرد کە کوورەکە بدەفێ، سەیری کوورە دەفدراوەکە و دەوروبەرەکەم کرد کە بزانم کێ کوورەکە دەدەفێ. دیسان داسەکە سوور بووەوە. ئاسنگەر بانگی کرد بەسە چیدی مەیدەفە. چیتر کەس کوورەی نەدەفی. دیسان سەیری دەوروبەری خۆم کرد، کەس لە دوکانەکە نەبوو. کاتێک باش ورد بوومەوە لە دیوارەکەدا کونێک سەرنجی ڕاکێشام. لە کونەکە نزیک بوومەوە، لەگەڵ چاڵێک لەودیوی کونەکە پەیوەست بوو، لەوێ دەنگێک دەهات، بەڵام لەبەر تاریکی کەس نەدەبیندرا. زیاتر چوومە پێش، گوێم لە هەناسەی کەسێک دەبوو. سەرم لە کونەکە بۆ ئەودیو بردەپێش، ژوورۆچکەیەکی بچوک بە ئەندازەی کولانەیەکی مامران، تاریک تاریک بەدی دەکرا. چاوم کە لەگەڵ تاریکییەکە ڕاهاتن، لەوێ دەزگایەک کە ئاسنگەرەکان بۆ دەفینی کوورە بەکاری دێنن بەدی دەکرا، بەڵام ئەو کەسەی کە کاری بە دەزگاکە دەکرد دیار نەبوو. بانگم کرد

"کێ لەوێیە؟ کێ دەزگاکە دەدەفێ؟" هیچ دەنگێک نەهات. بە ئارامییەوە گوتم "کێیە، کێیە لەوێ دەزگاکە دەدەفێ؟"

دەنگێک بە ئاستەم، نزم و کچانە گوتی: "منم زارا."

دەنگەکە ڕایچڵەکاندم. گوتم: "با بتبینم، با شێوەت ببینم."

لەنێو تاریکییەکە، لەپشت دەزگاکە دووچاوی بریسکەدار، وەکو چاوی کارمامزێک کە لە ڕاوچی ڕەمیدە بێت دەرکەوتن. نەمدەزانی کە ئێستا خۆی نیشانی من داوە چی پێ بڵێم، بە هێمنییەوە گوتم: "سڵاو زارا، چۆنی؟"

کچۆڵە ماوەیەک سەیری کردم تا پیرەمێردەکە بانگی کرد و زارا دووبارە کوورەکەی دەفی. سەرم لە کولانگەکە کشاندەوە، بینیم وا دکتۆر لە بەردەم دەرگاکە وەستاوە و پێدەکەنێ، گوتی: "زارات بینی؟"

ڕووناکی لە چاوی دەدام. چەند کەسێک لە دێنشینییەکان لەگەڵ دکتۆر هاتبوون و لە بەردەم دوکانی ئاسنگەرەکە کۆبووبوونەوە. دکتۆر گوتی: "وەرە گوێ بدە قسەی ئەمانە."

وەک ئەوەی بڵێی پێشتر پێیگوتبوون کەوا من خەریکم شتگەلێک لە بارەی کوردەوە دەنووسم. پیاوێکی کەڵەگەتی دێهاتی ئاماژەی بۆ لای من کرد و گوتی:

"کاکە من لەسەردەمی حەمەڕەزا شا هەشت ساڵ لە زیندان بووم."

گوتم: "خوێندەواریت هەیە؟"

گوتی: "خوێندەواریم نییە، بەڵام کورد هەموو کاتێک ئازادی و مافی خۆی ویستووە و هەموو سەردەمێکیش دەوڵەتەکان کوردیان کوشتوە و هەوڵی لەنێوبردنیان داوە، بەڵام ئەوان دەبێ بزانن کە ئەمڕۆ ئەم کوردە ئازادی دەوێت، سبەی کوڕەکەی، دووسبەی نەوەکەی. کورد تا دێت هەر زۆر دەبێت. ئەمە کورد نییە کە لەنێو دەچێ بەڵکو دەوڵەتەکانن کە سەرنگون دەبن.

تێگەیشتنی قوربان؟"
دێهـاتیەکی دیـکە کە سـەروبەندی شـۆڕش لە زینـدان ئـازاد بووبوو، گوتی:
"ئێمە ئازادیمان هەر تەنێ بۆ گەلی کورد داوا نەکردووە، ئێمە تەنێ هەر بۆ خۆمان خەبات ناکەین، دەبێ هەمووان ئازاد بن، تورکمەنەکان، بەلووچەکان، تورکەکان، هەموان. کێشە تەنێ هەر کێشـەی ئـێمە نیـیە، لە هەمـوو جێـیەک هەر وایە. دێهـاتی بەلووچەکانیش وەک دێهاتەکانی ئێمەیە. ئێوە بڕۆن سەرێک لە دێهاتەکانی ئێمە بدەن، سەیر کەن گەرماومان نییە، کارەبامان نییە، داو و دەرمان نییە، هیچمان نییە. منداڵەکانمان دوو پۆل دەخـوێنن و واز دەهێـنن. ئـاخر ئـاوا نـابێ. ئـاوا دەرس کـوا دەخوێنـدرێت. ئێـوە خۆتـان بـڕۆن، ژیـانی ئـێمە ببیـنن. لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە هەر تەنێ بیر لە خۆمان ناکەینەوە."
لەگەڵ مێرمنداڵێک کە دکتۆر ڕایسپاردوە، چوینە نێو گوند. هەڵبەت شتێکی ئەوتۆ کە ناوی بنێین گوند بوونی نەبوو، لە خوار گردێک چەند ژوورێک بە حەوشـەی بچـووک و یەک لە دوای یەک دروست کرابوون. ژنان لەبەر دەرگا دانیشتبوون و خەریکی تەشیرێسی بوون. منداڵان لەنێو کۆڵانەکەدا دەخولانەوە. کپی و بێدەنگییەک سەرتاسەری گوندەکەی گرتبووەخۆ. سیانی ماڵەکان لە بن دەرگای ژوورەکانەوە دەهاتنە دەر و سەرەوژێر دەبووەوە. شرغەی مێش و مەگەس لەو ناوەدا وزەوزیان بوو. خـۆر لە سـیانەکەی دەدا و بـۆن بـۆگەنی لێهەڵدەستاند. مێرمنداڵەکە گوتی:
"ئەو شتانەی کە پێی دەڵێن لایەنی تەندروستی، ئێمە نیمانە. لەو گەرماوانەمان نین. لێرە تەنیا کار هەیە. ژنان و پیاوان و منداڵان لە بەیانیەوە دەچنە نێو کێڵگەکان تەنیا نەخۆش و منداڵان لە دێدا دەمێننەوە."

که به تەنیشت منداڵاندا ڕەت دەبووم لەبەرم هەڵدەهاتن و دەیانگوت: "بەخێر بێیت."
مێرمنداڵەکە گوتی: "ئەمانە کەسانی کە پانتۆڕیان لەبەربێ نەبینیوە، لەو کەسانە دەترسن کە چاکەت و پانتۆڵیان لەبەربێ."
بە دەوری دێیەکەدا سووڕاینەوە، هەموو پێنج خولەکی نەبرد کە هەموو ماڵەکانمان بینین. لەوێ کۆڵان، یان گۆڕەپانێک بوونی نەبوو، سێ چوار ڕیز خانوو کە باریکەڕێیەک لێکی جیادەکردنەوە، ئەویش بۆ ئەوەی کاتێک کەسێک دەستی منداڵەکەی گرتووە لەوێ بتوانێت تێبپەڕێت. کە بە دەوری دێیەکەدا سووڕاینەوە و گەڕاینەوە، منداڵەکان زیاتر بووبوون، هەموویان لە پێش ئێمە ڕایاندەکرد و بە مەودایەک دوور لە ئێمە رادەوەستان و "بەخێربێی"یان دەگوت. لە شوێنێک منداڵێک کە لە من ترسابوو، بە ڕاکردنەوە خۆی گەیاندەوە ماڵی خۆیان و لە پشت پەنجەرەی ژوورەکەیان بە حاڵەتێک کە نازانم تووڕەیی بوو یان شادی بە تامەزرۆییەوە هاواری کرد:
"بەخێربێی فارس، بەخێربێی"[1]
مرۆڤ کە ئەم حاڵەتانە دەبینێت ڕادەچڵەکێت.
کاتێک دیسان گەڕامەوە دوکانی ئاسنگەرەکە، دکتۆر خەریکبوو قسەی بۆ دێهاتییەکان دەکرد و نیشانی دەدان کە چۆن بۆ خەبات و تێکۆشان یەکبگرن، چۆن دەبێ ئەنجومەنەکان پێکبهێنن و چۆن دەبێ درێژە بە خەبات بدەن. دکتۆر لە بارەی لاوازی حیزبەکان و ڕێکخستنەکان کە هەن و ئەو بابەتانەی پێویستن بۆ یەکێتی و ڕێکخستن قسەی بۆ دەکردن و پێی

---

١-نووسەر ئەو بەخێربێیەی منداڵەکانی وەک خۆی هەر بە کوردی نووسیوە، بەڵام لە نێو کوردی ڕۆژهەڵات بە کەسانی غەیرە کورد بە تایبەت بە تورکە ئازەرییەکان دەڵێن عەجەم..

دەگـوتن کە ڕەوشـەکەی چـۆنە و دوژمـن کێـیە و دەوڵەت دەتوانێت چ ڕۆڵێک بگێڕێت.
ئاسـنگەرەکە کـارەکەی تەواو بووبـوو، زاراش لە کـونەکە هاتبووە دەر و خەریک بوو ئامێرەکانی ئاسنگەری باپیرەی کۆ کردبـوونەوە و خـۆی بـۆ ڕۆیشـتن بـۆ مـاڵەوە ئامـادە دەکـرد. پیرەمێرد دەیگوت:
"لە بەیانیەوە لەگەڵ خۆمـدا دەیهێـنم و دەچێتە ئەو کـونە تـا خۆر ئاوا دەبێت و هەردووکمان دەست لە کار هەڵدەگرین."
دڵـم تەنـگ بـوو. ئێسـتا کە لە کـونەکە هـاتبووە دەر، قـژە زیـرپینییەکەی، چـاوە زیتەڵەکـانی و دەسـتە بچوکەکانی لە ژێـر تیشکی خۆردا بە شێوەیەکی فرە جوان بەدی دەکران. کەلوپەلی ئاسنگەری کۆکردەوە و خۆی لەسەر بەردێک دانیشت و لە ئێمە ڕامابوو.
ئەو بیری لە چی دەکردەوە. لە بەیانییەوە تا خۆر ئاوا دەبێت لەو کونەدا لەگەڵ باپیرەیدا هەردووکیان پێکەوە لە دوکانەکە کار دەکەن تـا ئێـوارە داسـێک دروسـت دەکرێت، دوای خـۆر ئـاواش بـاپیرە دەچێـتە بەردەم دوکـانەکەی و لەگەڵ پیرەمێردەکانـدا دادەنیشـێت سـیغار دەکێشـێت و زارا دەچێـتەوە مـاڵەوە و دەخەوێت. باسی یاریکردن هەر مەکە، باس لە کچانی دیکە هەر مەکە. بـۆچی کچەکـانی دی لە کـوێن، ئەوانـیش لە کـونێکی دیکەدان. دکتۆر گوتی با بڕۆین. وەڕێ کەوتین و خواحافیزیمان لە دێنشینەکان کرد. زارا لە گۆشەیەکی دوکانەکە دانیشتبوو هەر سەیری ئێمەی دەکـرد. لە دوکـانەکە دوور کەوتینەوە، سـواری جیپەکە بووین. دکتۆر تفەنگەکەی لەبن قاچەکانی دانـا. خەریـک بـووین بجـووڵێین، زارا هـاتە بەردەم دوکـانەکە ڕاوەسـتا، ئـێمە وەڕێ کەوتـین، زارا لە بەردەم دوکـانەکە ڕۆیشـت و چـوو لەگۆشەیەکی دوورتر لە دوکان لەسەر بەردێک دانیشت و چاوی

بڕیبووه ئێمه که خەریک بووین دوور دەکەوتینەوە. گوتم دکتۆر ماشێنەکه ڕاگره. جێپەکه ڕاوەستا. چەند بەستەی بسکویتی بچوک لەنێو جانتاکەم هەبوون، دەرمهێنان و به نەرمه غارێک بۆ لای زارا چووم و خستمه نێو کۆشی. بە بێ ئەوەی سەیری بسکویتەکان بکات کاتێک خەریک بووم دوور دەکەوتمەوە دەستی بۆ ڕاوەشاندم و گوتی:

"بەخێربێی کاکه، بەخێربێی."

کاتێک لەتەنیشت دکتۆر دانیشتم و جێپەکه کەوتە ڕۆیشتن، دکتۆر به دەنگی بەرزەوە پێکەنی! له تەپۆڵکەکان سەرەو ژێر بووینەوە. من بیرم دەکردەوە که ڕۆژێک دادێت و ئازادی بەدی دێت و له پای ئەو ڕەنجەی که ئەو کێشاویە، منداڵەکانی ئەو له کوردستانێکی ئازاد و ئاوەداندا به شکۆوە دەژین.



## له پرسەی شەهیدانی بانەدا بەشدار دەبین

کاتێک له گوندی بەردەڕەش گەڕاینەوە شار، شەو داهاتبوو. دکتۆر گوتی:

"پێویست ناکات بچیته هوتێل، لەگەڵ هاوڕێیان به."

شەو لەگەڵ یەکێک له کوڕەکان چووینەوە ماڵی ئەوان. دوای نانخواردن بڕیاردرا بچینه مزگەوت. له ڕۆژی تەقینەوەی نارنجۆکەکە یەکێک له هاوڕێیانی خەباتگێڕی کورد گیانی له دەست دابوو. پێشمەرگەیەکی شاری بانه بوو. له مزگەوت بڕیار وابوو یەکێک له پیاوه ئاینییه تێکۆشەرەکانی ناوچەکە وتارێک پێشکەش بکات. هەموو گەنجانی شار هاتبوون و گردبوونەوەکە زیاتر بۆ نیشاندانی ئەو یەکێتی و یەکڕیزییه بوو که ڕۆڵەکانی کورد هەمیشه هەوڵیان دەدا بیپارێزن. کاتژمێر نزیکەی یازدەی شەو بوو مەلایەکی بالابەرز، که ڕیشێکی پڕی هەبوو و کەوا و سەڵتەیەکی سپی پۆشیبوو له مزگەوت وەژوور کەوت. هەموویان وەک ڕێزلێنان لەبەری هەستان. پیاوه ئاینییەکه بێ ئەوەی دابنیشێت یەکسەر بەرەو مینبەرەکه چوو و ڕووه و ئامادەبووان وەستا. دەستێکی به پشتێنی داهێنا و به جۆش و وروژان و دەنگی بەرزەوه دەستی پێکرد:

"ئەو گەمژانه چییان دەوێت با بیڵێن، با بیڵێن، کورد چەکی خۆی دانانێت."

دوانیوەڕۆی هەمان ڕۆژ گرووپێک له قومەوه هاتبوون، داوایان له مەلاکه کردبوو، ئامۆژگاریی خەڵکەکه بکات چەک

دابنێن، ئەویش ئێستا لە وەڵامی ئەو گرووپەی قوم ئاوا بە جۆش و خرۆش و توورەییەوە قسەی بۆ خەڵکەکە دەکرد. "با بڕۆنەوە ئەو جێگایەی لێیەوە هاتوون، گاڵتەجاڕینە!"

گەنجەکان لە مەلاکە بە جۆشتر بوون، ئەوان باش هەستیان بە پێویستی یەکێتیی کار و خەبات دەکرد. دەتوانم بڵێم ئەو گەنجانەی لەوێ بوون هیچیان تۆزقاڵێک مەیلی ئاینیان نەبوو، بەلام دەیانزانی پیاوە ئاینییەکە چ کاریگەری و دەسەڵاتێکی لەنێو خەڵکدا هەیە. بۆیە لە دڵەوە دەیانگوت بژی مەلا خەباتگێڕەکەمان. دەبێ چەک لە شان و ئازایانە بوەستین و گوێ لە قسە و ڕێنوێنییەکانی بگرین و پشتیوانی لێ بکەین.

مەلا هێشتا هەر بەردەوامە:

"ئاخوند ناتوانێت وڵات بەڕیوە ببات، ئێمە دەڵێین وڵات چۆن بە ئاخوند بەڕێوە دەچێت."

من لە قسەکانی نەدەگەیشتم، هەر تەنیا دەمتوانی هەستیان پێ بکەم، کوڕەکان دواتر بۆیان وەرگێڕامە سەر فارسی:

"ئەو ئاخوندەی ئێمە دەیناسین ناتوانێت، بەڵێ ناتوانێت. دەبێ ئەنجوومەنەکان وڵات بەڕیوە ببەن... کۆماری ئیسلامی نایەوێت، ئەو ئیسلامێکی جیاوازی دەوێت، کۆمارێکی جیاواز.."

دواتر قسەکانی ئەویان وا بۆ گێڕامەوە: (ئەوان ئاخوندەکان وەکو پێغەمبەران پێناسە دەکەن. دەبێ بزانن ئەمجارە بۆیان ناچێتە سەر، گوورزی وا بە تەپلەسەریان دەکەوێت دایاندەپلۆسێت و لە قوڕیان دەباتە خوار..) ئەو قسەیەی وەڵامدانەوەیەکی توند بوو بەوانەی لە ڕادیۆدا ڕێبەرانی قومیان بە پێغەمبەرئاسا پێناسە دەکرد. (ئەو دیکتاتۆرانە ئیسلام و قورئان نابووت دەکەن.)

(لە بانە بۆمبێکی قورمیشکراو دەتەقێتەوە، ئەوان لە قومەوە دەڵێن ئەو نەفامانە لەنێو چیاکان، ئەو یاخیانە بە هۆی نەزانینەوە

خۆیان بە کوشت دەدەن.)

مەلا زیاتر دەنگی هەڵبڕی:

"لێرەوە بە قـوم دەڵـێم، بە تـاران دەڵـێم بە دەنگـی بەرزەوە پێیان دەڵێم گوێ بگرن، ئێمە دیسـانیش بۆمبی قورمیشکراومان لە ناشـــارەزاییەوە پێـــدادەتەقێتەوە، ئـــێمە دیســـان لەبەر کەمتەرخەمـی و ناشـارەزایی خۆمـان بە کوشـت دەدەیـن، بەڵام دواجـار بۆمبە قورمیشـکراوەکانمان لەسـەر ئەو چرکەسـاتەدا کە پێویستە و مەبەستمانە دادەنێینەوە."

لاوەکان بە جۆش و خرۆشەوە هاواریان کرد.

مەلاکە قسـەکانی تەواو بـوون لەگەڵ گەنجەکـان بەرەو مـاڵی شـەهیدێک کە ئەو پرسـەیان بـۆ دانـابوو وەڕێکەوتـین. نیوەشـەو لای دابوو. هەمووومـان بەهێمنی هەنگاومان دەنا تا گەیشتینە ماڵی کـــوردێکی خەبـــاتگێڕ، کوردێـــک کە ژیـــانی خـــۆی لە پێنـــاو بە دەسـتهێنانی ئـازادی بەڕێکردبـوو. خـانوێکی بچـوک بـوو، بـاوکی وەرزێرێکی هەژار بوو کە دەمێک ساڵ بوو مرد بوو. شـەهیدەکە بە درێژایی ئەو ساڵانە سەرپەرشتی دایک و برا و خوشـکەکانی لە ئەستۆ گرتبوو تـا خوشـک و براکـانی گەورە بووبـوون. ئێسـتا بـرا و خوشـکەکانی هـاتبوونە بەردەرگـا بـۆ بـرا شـەهیدەکەیان شینیان دەگێڕا. خوشکەکان سرودێکی کوردیان دەخوێند. براکـان بە کوردی شتکەلێکیان دەگووت:

(ئەو زیندووە. خەباتگێڕان زیندوون، ئەوانەی کە داکۆکیکـاری زەحمەتکێشانن هەرگیز نامرن.)

دەنگی براکان لە حەوشەی ماڵێدا دەزرنگایەوە:

(سڵاو لە تێکۆشانی زەحمەتکێشان، پارێزەرانی جووتیاران.)

قەت نەمبینی بوو کە لە کاتی مردنی خۆشەویسـتێکدا بـاس لە گەلان، بـاس لە ئـازادی، بـاس لە ڕەنجـدەران بکرێـت. لەو مـاڵە بچـــوک و تـــاریکەدا، لەو مـــاڵەی کە لاوانـــی بـــانەیی لە پرســـە

دانیشـــتبوون، خوشـــکەکان و برایەکـــانی ئەو هـــاوڕێ شـــەهیدە باســـیان لە گەلان دەکـرد و باسـیان لە گەلـی کـورد، لە نـان، لە خـاک، لە هاوبەشـیکردنی ئـێش و ئازارەکـان دەکـرد ئەو شـەوە لەگەڵ گەنجەکانی بانە چەندین کاتژمێر فرمێسکمان ڕشت.

***

## کۆمەڵەی تێکۆشەرانی ئازادی و بەدەستهێنانی مافەکانی گەلی کورد

ڕۆژی دواتر لەماڵی ئەو هاوڕێیە دەرچووین، سەرێکمان لە بنکەی کۆمەڵەکە دا. کوڕەکان لەوێ بوون و کارەکانیان ڕێک دەخست. مەکۆی کۆمەڵە قەرەباڵغ بوو. دێهاتییەکان دەهاتن و کێشە و گرفتەکانی خۆیان باس دەکرد و داوای ڕێگاچارەیان لە گەنجەکان دەکرد. گەنجەکانیش بە شێوەی گروپ دادەنیشتن و کەسی سکاڵاکەریان لەنێوان خۆیان دادەنا و لە ڕوانگەی جیاجیاوە هەڵیاندەسەنگاند و دواجار چارەسەرێکیان دەدۆزیەوە و کابرایان دەناردەوە بۆ گوندەکەی. کاتێک لەوێ دانیشتبووم و لەگەڵ ئەوانی دیکەدا سەرگەرمی ئاخاوتن بووم، کرێکارێکی شپرزە هاتە ژووری بنکەی کۆمەڵە و یەکسەر سۆراغی دکتۆری پرسی. تووڕە بوو. دکتۆر هاوڕێکانی دیکەی بانگ کرد کە زوو کۆ ببنەوە تاکو بزانن ئەو هاوڕێ کرێکارە چی دەڵێت. کوڕەکان لە دەوری مێزەکە گرد بوونەوە. هەموویان تەمەنیان لە کرێکارەکە بچوکتر بوو. دکتۆر دەیگوت:

'لە کوردستان پرسێکی بنچینەیی هەیە، ئەویش ئەوەیە کە کرێکار و دێنشینەکان متمانەیان بە ڕۆنشنبیران[1] هەیە. ئەوان متمانەیان هەیە کە تەنانەت هەر ئەم کوڕانە دەتوانن کێشەکانیان

---

١-ڕەنگە پێویست بێت روونی بکەینەوە ئەو (ڕۆشنبیر)ەی کە مەبەستی دکتۆرە لەگەڵ ئەو ڕۆشنبیرەی لە تاران لە پشت مێزێک دادەنیشێت جیاواز بێت. پەراوێزی نووسەر.

یەکلایـــی بـــکەنەوە، ئەوان زووزوو دەکەونە ژێــر بانـــدۆری ڕۆشنبیرەکان ئەوان بڕوایان هەیە کە ڕۆنشنبیر لایەنگری ئەوانە. لەو ساتەی کە هەندێک هۆشیاریان لە بڕێک پرسی سیاسیدا پەیدا کردووە، زیاتر ڕووە و ئێمە دێن و خواست و ڕەخنەکانیان زیاتر بووە و باس لە پرسگەلی زیاتر دەکەن، بەڵام کێشەیەکی گەورە هەیە، ئەویـــش ئەوەیە کە کرێکـــاران کـــاریگەری و پێویستبوونی پەیوەندیان لەگەڵ وەرزێراندا دەرک ناکەن، بۆ ئەوان تێگەیشتن لەمە گرفتە، کە زەحمەتکێشان بە داکۆکیکاری خۆیان بزانن، بەڵام کوڕەکان هەموویان لە هەوڵ و تێکۆشان دان و باوەڕیان بەوە هەیە کە ئەو گرفتە چارەسەر دەبێ.[1]

کرێکارێـک کە بە تـووڕەییەوە هـاتبووە ژوور، کاتێـک کە کوڕەکـان لە دەوریـدا کۆبـوونەوە و قسـەیان لەگەڵـدا کـرد، تورەبوونەکەی کەمتر بووەوە. کوڕەکان بەشێک لە قسەکانی ئەویان بۆ وەردەگێڕام و هۆکاری تووڕەبوونەکەیان بۆ باس کردم. ئەو دەیگوت:

"ئەوەندە لەگەڵ یەکدا ناکۆک مەبن، ئەو هەموو هێز و لایەنە پێشکەوتنخوازە دەبێ یەک بگرن، بە کەڵکی چی دێت یەکێک لێرە ڕێکخراوێک دروست بکات و یەکێک لەوێ. نابێ هەر یەکە و لە ئاشێکەوە لێ بکات و ئاوا پەرشوبڵاو بن. ئاوا هیچ بە هیچ ناکرێ و سوودی نییە. ئەو حیزب و هێزانە لە کوردستان دەبێ یەکبگرن. مەگەر ئاگاتان لێ نییە خەریکن سوپا بۆ لەنێوبردنی ئێمە ساز و ئامادە دەکەن، ئێوە و خوا زوو بن، درەنگ دادێ، تا زووە خۆتان یەکخەن و یەکبگرن."

کرێکارەکە قژی خۆی ڕادەکێشێت و دەڵێت: "درەنگ دادێت هیچ کەس گەلی کورد ناپارێزێت، خۆمان دەبێ لە خەمی خۆماندا بین."

ئینجـا ڕوخسـاری حـاڵەتی پـاڕانەوە بەخـۆوە دەگرێـت. ئەو

کرێکاری کوورەخانەیە.

ئێستا با ڕێکخراوەکان باشتر بناسین، ئێستا ئەو کرێکارەی کوورەخانە دەپارێتەوە کە هێزەکان یەکبگرن. منیش دەرفەتێک دەدۆزمەوە کە بڵێم تا ئێستا ئێمە لەگەڵ چوار حیزب یان چوار ڕێکخراو ئاشنابووین و لێرە بە دواوە زیاتریش لەگەڵیان ئاشنا دەبین.

یەکێک ئەو حیزبی دیموکراتی کوردستانەیە کە لەسەردەمی قازی محەمەد لە دڵی کوردستاندا ماوە، بەڵام لاوانی دەرسخوێن ئەوانەی خوێندنیان تەواو کردووە، نەک "خەڵکە رەشۆکەکە" ئامادە نین وەکو باوانیان بە چاوبەستەیی بە دوای ئەو حیزبە بکەون. لە هەر دەرفەتێک بۆیان بلوێ روو لەو حیزبە وەردەگێڕن و ناپاکییەکانی ئەوان ئاشکرا دەکەن و هەوڵ دەدەن کە ئەو حیزبە ریفۆرمخوازە کە لە سەرکردایەتییەکەیدا دەستەیەک دەرەبەگ و وردە بورژوای خۆشگوزەران و بوررژواکان دەسەڵاتیان هەیە بەرکەنار بکەن، هەڵبەت کارێکی فرە سەختە.

ڕێکخراوەکەی دیکە، ڕێکخراوی زەحمەتکێشانی شۆڕشگێڕی کوردستانە[1] کە لە بارەی ئەوانەوە تا رادەیەک قسەمان کرد، بەڵام چونکە ئەو ڕێکخراوە لە دەرەوەی کوردستاندا وەکو پێویست نەناسراوە، دەبێ زیاتر لە بارەیەوە ڕوونکردنەوە بدەین.

---

١- نووسەر هەندێ جار ناوی ئەو ڕێکخراوە بە ڕێکخراوی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستان و هەندێ جاریش بە ڕێکخراوی زەحمەتکێشانی شۆڕشگێڕی کوردستان دەهێنێ، کە هەمان ڕێکخراوی ئەوسای کۆمەڵەی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانە و لە نێو کورددا هەر بە کۆمەڵە ناسراوە. بە داخەوە ئەو ڕێکخراوەش دواتر جیابوونەوەی تێکەوت بوونە سێ بەش.

ئەو ڕێکخراوە بارەگایەکی ئاشکراو دیاریکراوی نییە، زیاتر ئەندامەکانی لە گوندەکانن و شان بە شانی وەرزێرانی لادێ خەبات دەکەن. ڕوخسارێکی گوندانەیان هەیە، ڕەنگبێ ماوەی زۆری پێ بچێت و سەرێک لەشار نەدەن (ژمارەیەک لە ئەندام و لایەنگرانی ئەو ڕێکخراوە بە شێوەیەکی ئاشکرا نەک بەناوی ڕێکخراو بەڵکو وەک تاکی ئازاد لە 'کۆمەڵەی خەباتگێرانی ڕێگای ئازادی و بەدەستهێنانی مافە نەتەوەییەکانی گەلی کورد' خەبات و تێکۆشانیان کردوە و کارە سیاسی و سەربازییەکانی شار و لادێ ڕێک دەخەن)

بەم دواییە، (ناوەڕاستی مۆرداد[1]) لە یەکێک لە گوندەکانی دەوروبەری سەردەشت چالاکیەکانی خۆیان ئاشکرا کردووە و بە ناوی (ڕێکخراوی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستان) نوسینگەیەکی بچووکیان هەر لەهەمان گونددا کردۆتەوە.

زۆر کەس لەبەر ئەوەی ئەندام و لایەنگرانی ئەو ڕێکخراوە زیاتر لە گوندەکان کار دەکەن، بە 'ماوییست' دەزانن، بەڵام ئەندامانی ئەو ڕێکخراوە بە بیستنی ئەو قسانە هاواریان لێهەڵدەستێت کە: ئێمە ماوییست نین، ئێمە پەیوەندیمان لەگەڵ کرێکارانیش زۆرە، بەڵام ئێستا ڕەوشی کوردستان وادەخوازێت کە گرنگی زیاتر بە جووتیاران و کۆمەڵانی ڕەنجدەری کوردستان بدرێت. ئەوان دەڵێن ئێمە بۆیە دەچینە نێو جووتیارانی لادێ تا ئاستی هۆشیاریی سیاسییان بەرزبکەینەوە و ناخی بۆگەنی ئاغاکان و دەوڵەت و ئیمپریالیزمیان بۆ ڕوون بکەینەوە. ئەوان دەپرسن: 'ئایا ئەو جووتیارەی کە ئێستا هەندێ شت تێ دەگات و فێر دەبێت، ئاغا دەناسێت و ئیمپریالیزم و

---

٢-بەراوردکردنی مانگی مۆرداد لەگەڵ ساڵنامەی زایینی لە ٢٣ی مانگی ٧ دەست پێداکات تا ٢٢ی مانگی ٨.

دەوڵەتـی گرێـدراوی ئیمپریـالیزم دەناسـێت، باشـتر ناتوانێـت داکۆکی لە کرێکاران بکات و ئاگای لێیان بێت و بیانپارێزێت؟"

ئەوان کاتێک کە ئەو پرسـیارانە دەکەن، بەر لەوەی کەسـێک بیرێکی نـاڕێکی بە مێشکدا بێت جەخـت دەکەنەوە کە: 'هەڵـبەت کارکردن لە ناوچە پیشەسازییەکان زۆر پێویستە.'

ئەو ڕێکخراوە بـاوەڕی وایە کە تـاکە ڕێگـای ڕزگاری گەلانـی زۆرلێکراو، بریتییە لە شەڕی چەکداریی درێژخایەنی جەمـاوەری بە ڕێبەرایەتیی حیزبی هاوچەرخی چینی کرێکار.

لە ئەنـدامانی ئەو ڕێکخـراوە دەتـوانین وەک نمـوونە نـاوی شەهید سـەعیدی موعینی[1] ناسـراو بە (خـانە) و شـەهید مـحەمەد حەسەنی کەریمی ناسراو بە (سـاڵح بەننا)، بێنین.

ڕێکخراوی دیکە، ڕێکخـراوی چریکە فیداییەکانی گەلی ئێرانە کە لەبارەی ئەوانەوە بە درێژی باس دەکەین. تەنیا ئەوە بڵێم کە ئەو ڕێکخـــراوە بە هـــۆی لایەنگرەکـــانیەوە لە ســـەروبەندی شۆڕشـــەوە تـا ئێسـتا کە مـانگی مـۆردادی سـاڵی ١٩٧٩یە و دەوڵەت بە دوای دەرفەتـدا دەگەڕێ، کە هەر سـاتێک بـۆی بلـوێ پەلاماری کوردستان بدات، توانیویە بە شێوەیەکی زۆر بـاش لە کوردســـتان دەســـت بە کـــار بێـــت لە ڕووی (سیاســـی و ســـەربازی)یەوە جێگـای خـۆی لە دڵـی خەڵکیـدا کـردۆتەوە. لایەنگرانـــی ئەو ڕێکخـــراوە لە ســـنە و بە تـــایبەت مهابـــاد بە

---

١-سەعیدی موعینی کە هەر بە خانە ناسرا بوو برای شەهید سولەیمانی موعینی و عەبدوڵلای موعینییە کە سولەیمانی موعینی لە سەردەمی شۆڕشی ئەیلوولدا لەلایەن پاراستنی پارتی دیمکراتی کوردستانەوە گیراو و دواتر شەهید کرا و تەرمەکەی تەسلیمی ڕژێمی شـای ئێران کرایەوە، محەمەئەمین موعینیی باوکیشیان لە کۆمـاری کوردسـتاندا وەزیـری کاروباری ڕۆشنبیری بوو، ئێستاش کاک سیامەندی موعینی هاوسەرۆکی پارتی ژیانی ئازادی کوردستان (پژاک)ە.

شێوەیەکی کاریگەرانە خەبات دەکەن و ترپەی دڵی کوردستانیان گرتووە، ئەوان لە هەر جێگایەک تێکهەڵچوون ڕوویدات، زۆر خێرا ڕەوشەکە شیدەکەنەوە و خۆیان دەگەیەننە ئەو شوێنە و ئەوەی پێویست بکات شان بە شانی دێنشینەکان چەک هەڵدەگرن و دەچنە شەڕی دوژمن و هەر لەوێش دێنشینەکان لەسەر شێواز و تاکتیکەکانی شەڕ رادەهێنن و فێریان دەکەن، هەڵبەت لە هەموو ئەو حاڵەتانەی دەکرێ کەسانی سەر بە ڕێکخراوی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانیش لە ڕیزی پێشەوەی بەرەکەدا بەشێوەیەکی بەردەوام ببینین، دێهاتییەکان، لایەنگرانی چریکەکان بە هۆی ئارمی چەکوش و داس دەناسنەوە. کاتێک لە یەکێ لە پێشمەرگەکانی حیزبی دیموکراتم پرسی کام ڕێکخراوت خۆشدەوێت بە سەرفرازییەوە گوتی: "من ئەندامی حیزبی دیموکراتم."

گوتم: "دەزانم، جگە لە حیزبی دیموکرات کامەیانت خۆشدەوێت؟". سەیرێکی دووروبەری کرد. کاتێ دڵنیا بوو کەس لەو ناوە نییە، گوتی:

"چریکەکانم زۆر خۆشدەوێن، ڕێکخراوی زەحمەتکێشانی کوردستانیشم زۆر خۆشدەوێت." منیش دەمزانی کە ئەو حیزبی دیموکراتی زۆر خۆشدەوێت. بە شێوەیەکی گشتی جەماوەری بەربڵاوی کورد حیزبی دیموکراتیان زۆر خۆشدەوێت، ڕێکخراوی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستانیشیان زۆر خۆشدەوێت، چریکیەکانیشیان بە هەمان شێوە زۆر خۆشدەوێت.

ئەمەش بۆ ڕێکخراوێکی وەک "چریکە فیداییەکانی گەلی ئێران" زۆر بەهادارە، کە کەسێکی سەر بە حیزبی دیموکرات زۆر خۆشی بووێت، ئەویش لە کاتێکدا ڕێبەرایەتیی حیزبەکە کەیفیان بە چارەی چریکەکان نایەت و ئەوان بە منداڵ و پاڵ ناو دەبات و تا ئەو شوێنەی نەبنە بەربەست لەبەردەمیان کارێکیان

پێ نین. یەکێک لە کەسە دەسەڵاتدارەکانی حیزب دەیگوت ئەگەر پێدرێژی بکەن دەیانسڕینەوە. هەڵبەتە ئەمە قسەیەکی بێ بەها بوو، قسەیەک وەک ئەوەی پیرەمێردێکی دەسەڵاتخواز کە لە شوێنێکی گەرم و نەرمدا دەتوانێت بیکات، بەڵام ئەوەی گرنگە ئەوەیە، ڕێکخراوی چریکە فیداییەکانی گەلی ئێرانیش هێشتا نەبۆتە سەرئێشە بۆ حیزبی دیموکرات.

ڕێکخراوی دیکە هەن، نازانم دەشێ ناویان بنێین ڕێکخراو یان نا، بە هەرحاڵ یەکێتییە جووتیارەکانن کە ئەوانیشمان ناسین.

ڕێکخراوی دیکەش ماوە، ئەویش "کۆمەڵەی خەباتگێڕانی ڕێگای ئازادی و بەدەستهێنانی مافە نەتەوەییەکانی گەلی کورد"ە کە بە "کۆمەڵە"ش ناسراوە. ئەو ڕێکخراوە لە ڕیزی شۆڕشدا دادەندرێت. لە هەموو شارەکانی کوردستانیشدا بنکە و بارەگای هەیە. پرۆگرامێکی دیاریکراوی نییە، بەڵام سەرجەم هێزە پێشکەوتنخوازەکان بە جیاوازیی ئیدۆلۆژیایان دەتوانن کاری تێدا بکەن. (هەڵبەت جگە لە لایەنگرانی حیزبی تودە[1] و حیزبی دیموکرات و ڕێکخراوی شۆڕشگێڕی کە بڵاوکراوەی زمانحاڵی ڕێکخراوەکەیان ناوی "ڕەنجبەر"ە). زۆرترین کەسە چالاکەکانی بریتین لەو گەنجانەی کە چەند ساڵ زیندانیان کێشاوە و دەتوانین بڵێین کە هەندێ لە کەسەکانی ڕێکخراوەکە نا بەڵکو

---

١-حیزبی تودەی ئێران لە ساڵی ١٩٤١ لە لایەن کۆمەڵێک ڕۆشنبیری سیاسیی ئەو سەردەم کە بە ٥٣ کەسەکە ناسروان دامەزرا و یەکێک لە ڕێکخراوە سەرەکییەکانی هێزی چەپ و سۆسیالیستی بووە لە سەر ئاستی هەموو ئێراندا. ئەو حزبەش دوای شۆڕشی ئێران کەوتە بەر هێرش و پەلاماری کۆماری ئیسلامی زۆر لە سەرکردەکانی گیران و کوژران، چالاکییەکانی حزبەکەش بە تەواوی قەدەغە کران. دەتوانین وەک هاوشێوەی حزبی شیوعی عێراقی ناودێری بکەین.

وەکو تاکیی ئازاد ڕۆڵی کاریگەریان هەیە. پێشتر لایەنگری چریکە فیداییەکانی گەل لەو کۆمەڵەیەدا لەگەڵ ئەوانی دیکە چالاکی و خەباتیان دەکرد، بەڵام کاتێک ڕێکخراوەکە (لە کوردستان) گەشەی کرد، لایەنگرەکانی بۆ لای خۆی ڕاکێشا و بەو شێوەیە لایەنگرانی ڕێکخراو لە کۆمەڵەکە هاتنەدەر و (ڕێکخراوی پەیکار) لەبەر ئەوەی بنکە و نووسینگەی لە کوردستاندا نەبوو، ئەو دەرفەتەی قۆزتەوە و لایەنگرەکانی خۆی بەرەو ئەو کۆمەڵەیە ڕێنوێنی کرد و لەوێ جێگیری کردن. ئێستا ڕێکخراوی پەیکار دەمێنێتەوە و ڕێکخراوی شۆڕشگێڕانی زەحمەتکێشانی کوردستان و ڕەنگ بێت ڕێکخراوگەلی دیکە، وەک یەکێتییە کۆمەنیستەکان و حیزبی کرێکارانی سوسیالیست و... چونکە ڕێکخراوی پەیکار لە ڕووی تیۆرییەوە بە بەراورد بەو ڕێکخراوانە بەهێزترە، دەکرێت پێشبینی ئەوە بکەین کە ئەگەر ئاوا بۆ پێشەوە بڕوات لە ئایندەدا ڕێبەرایەتی "کۆمەڵەی خەباتگێڕانی ڕێگای ئازادی و بەدەستهێنانی مافە نەتەوەییەکانی گەلی کورد" بگرێتە دەست.

***

## بەبیرهێنانەوەیەکی بێهوودە

ئێستا کە ڕێکخراوەکانمان ناسی، ئەوەش بڵێین کە هەر یەک لەو ڕێکخراوانە ژمارەیەک پێشمەرگەی خۆیان هەیە. لە هەر جێگایەک شەڕ و تێکهەڵچوون بێتە ئارا، بە گوێرەی لێکدانەوەی هەر ڕێکخراوێک سەبارەت بەو شەڕ و تێکهەڵچوونە ئەگەر پێویستی کرد وەکو بروسکە پێشمەرگەکانی خۆیان بۆ مەیدانی شەڕەکە ڕەوانە دەکەن. ئەرکی ئەو پێشمەرگانە بە پێی لێکدانەوەی خۆیان سەبارەت بە تێکهەڵچوونەکە لە دوو حاڵەت بەدەر نییە: یان دەبێ بچن و لە سەنگەری گەلدا بن و شەڕ بکەن، بەمپێیە دەچن و بەشداری شەڕەکە دەکەن. یان ئەو تێکهەڵچوون و شەڕە لە بەرژەوەندیی گەلی کورددا نابینن و دەبێ بچن و ببنە ناوبژیوان و بەربەست و لێنەگەڕێن شەڕەکە هەڵگیرسێت و تەشەنە بکات. لەو حاڵەتەشدا دەچن و بە ئەرکی خۆیان هەڵدەستن.

ئا بەو شێوەیە دەبینن کە ڕێکخراوەکان بە پێی لێکدانەوەی خۆیان دەتوانن لە نێو دڵی خەڵکدا جێی خۆیان بکەنەوە یان بە پێچەوانە تا دێت لە خەڵک دوور بکەونەوە. ڕێکخراوی 'چریکە فیداییەکانی گەلی ئێران' تا ئێستا جێگای خۆی لە نێو دڵی کۆمەلانی خەڵکدا کردۆتەوە. حیزبی دیموکرات لە شەڕەکاندا.... بەڵام زیاتر لایەنگری ئاغاکان بووە. کۆمەڵە و ڕێکخراوی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشان توانا و ئیمکانییەتی ڕێکخراوی چریکەکانیان نییە.

## پێویسته بچیته کوردستان و بیبینیت

هەموو شتێک لە کوردستاندا جیاوازە. لێرە تفەنگ شتێکی ئاسایییە، تەقینەوەی بۆمبێک وەکو شکانی شووشەیەک وایە، تەنانەت با نۆ کەسیش بکوژێت. هەڵبەت ئەگەر نەتەوێت دەوڵەتی تێدا تاوانبار بکەیت، سەروسەداکەی زوو دادەمرکێتەوە و لەبیر دەکرێت.

لە تاران، شیراز، ئیسفەهان، قوم پیرەمێردێک لانی زۆر دەتوانێت دوای تەمەنێک کارکردن خانەنشین ببێت و بچێت لە کونجی ماڵێدا دابنیشێت و لاپەڕەی بیرەوەرییەکانی هەڵداتەوە، یان دوا ڕۆژەکانی تەمەنی لەگەڵ داودەرمان و دکتۆر و نەخۆشی بەڕێ بکات، یان لانی زۆر بچێت دوکانێکی وردەواڵەفرۆشی بکاتەوە و بنیشتی کەڵەشێرنیشان بفرۆشیت، بەڵام تۆ لە کوردستان پیرەمێردەکان دەبینی کە لە جیاتی گۆچان تفەنگێکی درێژی بڕنۆ بەشانیانەوەیە و لە جیاتی شاڵێک لە پشت بئاڵێنن و خۆی پێ گەرم بکەنەوە، ڕەختەیەک فیشەکیان توند لە پشتی خۆیان بەستووە و قیت و قۆز و توندبەند بەنێو شاردا دەسووڕێنەوە. لە کوردستان هەموو شتێک شێوەیەکی دیکەی هەیە. ئەگەر بتەوێت کوردێک ببینی دەبێ لە کێڵگەیەکدا بیبینی. ژنانی کورد شان بە شانی پیاوان لە کاروباری دروێنەی گەنم، لە گێرەکردن و گواستنەوەی دانەوێڵە و بەروبوومەکان بۆ ماڵەوە، کار دەکەن. کراسە چین چینەکانیان دەخەنە نێو شەلواری فشوفۆڵ و لە جەنگەی بەیانییەوە تا ئێوارە دادێت چەماونەتەوە و وەکو مریشک دانە بە دانەی گوڵە گەنمەکان

هەڵدەگرنەوە و پەرێزەکان پاک دەکەنەوە، یان دروێنە دەکەن. ژنی کورد لە هەموو بوونەوەرێکی دیکەی دنیا زیاتر کار دەکات و ماندووترە. ئەو هەرگیز ئەوەی لە شار هەیە یان لە گوندەکانی دیکەدا هەیە لێرە نابینێت. ناتوانیت پێشبینی بکەیت کە لەبەر سەختی کارکردن ڕوخساریان چی لێ دێت، هەموو ئەو پێناسانە و وێناکردنانە کە لە بارەی ژنەوە هەمانە بە بینینی ژنێکی دێنشینی کورد دەسڕێنەوە. ئەو بوونەوەرێکی دیکەیە، دەبێت ئەو لە نێو کێڵگە و لە نێو پەرێز و لە کاتی دروێنە و دەسکەنەی نیسک و نۆک و کاتی لێکردنەوەی گەڵای توتن و کاتی گونیەی دانەوێڵەکان دەخاتە سەر پشتی یان کاتی ڕەنج و ئازار کە بەردەوام بۆ ئەو هەیە، ببینی. بۆیە ژنی کورد لەگەڵ پیاوەکەیدا داوای ئۆتۆنۆمی دەکات و ئازادی خۆی دەوێت. منداڵان لە گوندەکانی کوردستاندا لەو کاتەی لە دایک دەبن کەس دەرفەتی ئەوەی نییە ئاگای لێیان بێت، ئەوان لەنێو کێڵگە و پەرێزەکاندا هەر بۆ خۆیان فەراژی و گەورە دەبن و هێشتا نەیانتوانیوە خۆیان بناسن کە کارکردن لە کێڵگە دەست پێدەکات و بەردەوام دەبێت تا ڕۆژێک دێت دەبینی مووەکانی سپی بووە، ئەو کوردێکە و وەرزێرێکە و ئۆتۆنۆمی دەوێت.

***

## به لێواری سنووردا دەچینە پیرانشار

کاتێک لە کوڕەکان جیا دەبوومەوە و دەمویست درێژە بە ڕێگاکەم بدەم، دکتۆر گوتی:

"بوەستە، چەند لە هاوڕێیانمان دەچنە پیرانشار[1]، بە ئۆتومبێل لەگەڵ ئەواندا بڕۆ."

ئۆتومبێلەکە ئامادە بوو و بەڕێ کەوتین. کاتی ماڵاواییکردن دکتۆر توند دەستی گوشیم و گوتی:

"ئێمە چاومان لە هاوکاری و پشتیوانی ئێوەیە، ئێمە زۆرمان چاوەڕێ لە گەلانی دیکە هەیە."

ئۆتـومبێلەکە کەوتە ڕێ، بەڵام دکتـۆر نـیگەران بـوو، ئەوەم باش دەزانی.[2]

لە ڕێگای سنووری بانەوە کە بەرەو سەردەشت و پیرانشار دەڕوێـت بە چـاوی خـۆت لە هەمـوو جێگـایەک هەوڵ و ماندووبونی ژنان و پیاوانی زەحمەتکێش دەبینی، دەیانبینی کە لە کێڵگەکاندا سەرقاڵی کارکردنن. ڕێگا سنوورییەکە وەکو شریتێک بە دەوری گرد و تەپۆڵکەکاندا پێچ دەخوات و شۆڕ دەبێتەوە

---

١-پیرانشـار هەر شـاری خـانێیە بەلام نـاوە فەرمیـیەکەی پیرانشـارە و کوردیش زیاتر هەر ناوە کۆنەکەی خۆی واتە خانە یان خانێ بەکار دەهێنن.

٢-کە کاتی هات دکتۆر تفەنگەکەی هەڵگرت و لەگەڵ قارەمانانی دیکەی کورد بۆ خەباتی پارتیزانی چووە چیاکان. پەراوێزی نووسەر.

دۆڵەکان، دیسان سەرەوژوور دەبێتەوە و بە ڕۆخ رووبارێک کە بەکوردستاندا ڕەت دەبێت درێژ دەبێتەوە. لە دەشتە زەرد، سوور، قاوەیی و سەوزەکاندا تێدەپەڕێت، بە دەوری کانیاوەکاندا بادەداتەوە. لێرە و لەوێ ڕەزی مێوان بەدی دەکرێن، بە جێیان دێڵێت و خۆی دەگەیەنێتە سەردەشت و پیرانشار، لەوێوە بۆ مهاباد و ورمێ.

بە پێی ئەو نەخشەیەی کە حکومەتە بەکرێگیراوەکان لە سەردەمی ڕژێمی محەمەدڕەزا شا کێشاویانە، کوردستانی ئێرانیشیان پارچە پارچە کردووە. کە چەند کیلۆ مەترێک لە بانە ڕەت بووی بە پێی نەخشەکەی ئەوان سنووری کوردستان تەواو دەبێ و دەچیتە نێو سنووری 'ئازەربایجانی ڕۆژئاوا' شوێنێک کە هێشتا هەر کوردی لێیە، بە هەمان فەرهەنگ، هەمان هێز و ئوتوریتەی خۆیانەوە و داوای ئۆتۆنۆمی خۆشیان دەکەن و ئامادە نین یەک هەنگاویش لێی بکشێنەوە. یان دەتوانین بڵێین کە لە بانە دوور دەکەوینەوە بەرەو ئەو ناوچانە دەچین کە زێد و پێگەی مرۆڤە تێکۆشەرەکانی وەک مەلا ئاوارە و شەریفزادە و موعینییەکان و ئەوانی دیکەیە. ئەو ناوچانە مەکۆ و مەڵبەندی خەباتی جەماوەری و شۆڕشگێڕانەی کورد بووە.

کە بانە بەجێدێڵی و بەرەو سەردەشت دەڕۆیت، تۆپۆگرافیای ناوچەکە کەمێک دەگۆڕێت. بە درێژایی ڕێگاکە بەردەوام ڕەزی مێو دەبینی، لە کاتێکدا لە جادەکانی پێشتر ئەوە نابینی. مێگەلی بزن و مەڕ و گاڕانی مانگا لە لەوەڕگاکان، لە سەر گردەکان و لە نێوانی جادەکاندا بێ پسانەوە بەدی دەکرێن، بەڵام لە جادەکانی دیکەدا ئەو مێگەلانەت نەدەبینین. لێرە دەشتەکان سەرسەوز و جوانترن. پارچە گەنمەکان وەکو فەرشی ئاڵتوونی کە پارچە پارچە لەو دەشتە پێکەوە بەسترابنەوە لە تەنیشت توتنەوانەکان بەدی دەکرێن. لەو ناوچەیە کانیاوەکان زیاترن و

له هەمووی گرنگتر تا زیاتر بچیتە پێش دەگەیتە پیاوان و ژنان و منداڵان کە هیچ ناتوانن بە فارسی بدوێن، بە ناچار دەبێ بۆ تێگەیاندنی مەبەستت یان پرسینی ئادرەسێک سوود لە زمانی ئاماژە وەربگری. لەو ناوچەیە کەسی لایدەی وەک من زۆر بە دەگمەن ڕێی دەکەوێتە ئێرە، بۆیە ئەگەر ڕۆژێک لەو کێڵگانە یان لە لێواری کانیاوێک، یان لە پەنا پەرژینی ڕەزێکدا بە قەوڵی ئەو کوڕێژگە بانەییە کەسێکی دوولک لەپێ پەیدا ببێت، وەکو چقڵی چاوی ئەو دەشتە سەرنجی هەموو کەسێک بەلای خۆیدا رادەکێشێت. خەڵکی ئەم ناوە کەمتر ڕێیان کەوتۆتە شار. ئوتومبێل و پاس کەمتر لەو ڕێوبانانە بەدی دەکرێن. تا لە شار دوور دەکەویتەوە ئەو تایبەتمەنییە زیاتر دەردەکەوێت. کە ڕێگاکەمان تەی دەکرد، مێرمنداڵێکی دە دوازدە ساڵە لە نێوەڕاستی جادەکە ڕاوەستا و دەستی بۆ هەژاندین کە بۆی ڕابگرین. ئوتومبێلەکەمان ڕاگرت، کوڕێژگە هات و بە کوردی شتێکی گوت و ئاماژەی بە گردەکان دا. تێگەیشتم چی دەڵێت. چاوە بریسکەدار و سیما خۆربردووەکەی حاڵەتێکی کاساسانەی پێ بەخشیبوو، دواجار بە دەنگێکی بەرزەوە گوتی:

"فارسی بەلەد نیست."[1]

سەرەنجام سواری ئوتومبێلمان کرد و دواتر تێگەیشتین کە چ دەڵێ:

'دەتوانم سواری ئوتومبێلی ئێوە ببم، لەجیاتی بە پێیان بڕۆم؟ هەر تا نزیکەی ئەو گردەی ئەولا کە نزیکی سنوورە لەگەڵ خۆم ببەن، مەڕەکانمان لەوێ دەلەوەڕێن، من دەتوانم بە پێیان بڕم، بەلام ماندوو دەبم تا ئەوێم لەگەڵ خۆدا ببەن...'

ناوی ڕەسووڵ بوو، هیچی لە دنیادا نەدەزانی. دنیای ئەو تەنیا هەر ئەو جادەیە و ئەو گردە و مەڕەکانی و کانیاو و

---

١- نووسەرهەر ئاوای نووسیوە، وەک چۆن مێرمنداڵەکە دەری بڕیوە.

گونـدەکەیان بـوو، یـان ڕەنـگە ئەو ئۆتـۆمبێلانەی کە بێـرەدا تێدەپەڕن و ئەو بیانیانەی کە جار جارێک دێن و دەڕۆن و هیچ کات لێرە نامێننەوە.
به ئاماژە هەنـدێ شـتم لە ڕەسـوول پرسـی و ئەو هەر پێدەکەنی و تەنیا بە شێوەزارێکی خەستی عەرەبیانە بە کورتی وەڵامی دەدامەوە:
"ڕەسوول سەفەرت کردووە؟"
"ناوەڵلا"
ڕەسوول چوویتە بانە؟"
"ناوەڵلا"
ڕەسوول چوویتە ئەودیو سنوور؟"
"ناوەڵلا"
"ڕەسوول ناوی تارانت بیستووە؟"
"ناوەڵلا"
"ڕەسوول خوێندەواریت هەیە؟"
"ناوەڵلا"
ڕەسـوول تێیگەیانـدین کە لە نزیـک گردێـک کە مەڕەکـانی لـێ دەلەوەڕان، ئۆتومبێلەکە ڕابگرین تا دابەزێت. لەگەڵ ئەوەشدا کە زەینمـان هەر لەسـەر ئەوە بـوو دەسـتی نەکەوێتە بەر دەرگـای ئۆتومبێلەکە، دواجـار سـەرپەنجەی کەوتە بەر دەرگای ئۆتومبێل و ئـازار لە ڕوخسـاریدا دەرکەوت. ئەو حـاڵەتە خەمگینـی کـردین. نەماندەویسـت شـادمانییەکەی ئـاوا کۆتـایی پـێ بێـت، ئەنگوسـتی خستبووە بن هەنگڵی و لەبەر ئازار فشاری دەدا:
"ڕەسوول ئازاری هەیە؟"
"ناوەڵلا"
لە ڕەسـوول دوور کەوتینـەوە و بەرەو سـەردەشـت ڕێگامـان گرتەبەر.

## دەوڵەت دەیەوێت جەندرمە بگەڕێنێتەوە ناوچەکە

ڕژێمی محەمەدڕەزا شا بۆ هەر سێ چوارماڵێک کە لە قەدپاڵی گردێک، لە ڕۆخ کانیاوێک، یان لە پێدەشتێک دروست کرابن و ناوی گوندی پێوە بووبێ، پاسگایەکیان قیت کردۆتەوە و بۆ هەر پاسگایەکیش چەند ئوتومبێل و چەند ملەستوورێکی مشەخۆر دابەستترابوون و لەوێ خۆیان قەڵەو دەکرد و مووچەیەکی موفتیش بۆ هەر یەکێک لەو مشەخۆرانە بڕابووەوە، تەنیا بۆ ئەوەی هەر کوردێک جووڵە بکات و سەری بەرز بکاتەوە بە قۆنداغی تفەنگەکانیان بکێشن بە تەپڵی سەری و مێشکی بپژێنن.

ڕژێمی محەمەدڕەزا شا کەسانێکی دڕندە و تاوانباری بە ناوی جەندرمە لە هەموو شوێنەکانی کوردستان جێگیر کردبوو و ئەو ناپاکانە، تێکۆشەرترین و باشترین مرۆڤەکانی کوردستانیان لە خوێنی خۆیان گەوزاندووە. سەیر بکە کورد بۆ چی دەیەوێت خۆی ناوچەکانی خۆی بەڕێوە ببات و پارێزگاری لێ بکات، بۆچی دەیەوێت لە دەشتودەرەکانی نیشتمانی خۆی بسوورێتەوە، بۆچی دەیەوێت خۆی پاسەوانی سنوورەکانی بێت، لانیکەم لەبەر ئەوەیە کە جارێکی دیکە ئەو چەپەڵە بیانیانە، ئەو جەندرمانەی کە وەکو سێبەری مەرگ بە سەر گوندەکانیانەوە بوون، نەیێنەوە کوردستان. دەبینین هەر لەگەڵ ئەوەی خەبات دەست پێ دەکات، بەر لە هەموو شتێک کورد هەڵدەکوتێتە سەر پاسگاکان. جەندرمەکان باش دەزانن چ تاوانگەلێکیان کردووە، چیان بە سەر ئابڕووی دێنشینان هێناوە، بۆیە هەر ڕەوشەکە

تێکدەچێت، ئەوان وەکو کرمی نێو زەلکاوان خۆیان دەشارنەوە، ئینجا دەوڵەتی کۆماری ئیسلامی پێداگری دەکات کە دیسان ئەو جەندرمانە بگەڕێنێتەوە ناوچەکە.

ئاغا ئامریکییەکانیش پێویستیان بە جەندرمەیە، کورد دەبێ بخنکێندرێت، تروسکەی خەبات، تروسکەی تێکۆشانی ئازادیخوازانەی کورد دەبێ لەژێر پۆستاڵی جەندرمەدا کپ بکرێت. گەلی کورد لەبەر ئەوەیە کە هاوار دەکات و دەڵێت جەندرمەمان ناوێت و حکومەتی کۆماری ئیسلامیش هەر لەبەر ئەوەیە پێداگری دەکات کە جەندرمەکان لە ناوچەکە بمێننەوە تا دیسان هەمان تاس و هەمان حەمام ناوچەکەی بۆ کۆنترۆڵ بکەن.

خەڵکی کورد ئێستا لە هەموو ناوچەکەدا دەستی بەسەر پاساگا و ڕەبایەکاندا گرتووە و جەندرمەکانی لە کوردستان وەدەرناون و چەکوچۆڵ و ئوتومبێل و ئامێرەکانی ئەوانی بردووە و خۆی سەرفرازانە و شکۆدارانە لە سەرتاسەری سنوور و شاخ و پێدەشتەکانی وڵاتدا پاسەوانی دەکات، کەچی ڕادیۆی کرێگرتەکان بەردەوام دەنەڕێنێ کە کوردە جوداخوازەکان وڵاتیان خستۆتە بەر مەترسی و دەیانەوێت کوردستانی ئازیز لە دایکی نیشتمان جیا بکەنەوە. بە ناوی ئیسلام و قورئانەوە کەسانێکی برسی و بێکاریان وەکو پاسدار و قیادە موەقەتە راست کردۆتەوە و بەریان داونەتە گیانی خەڵکی کورد و هاواریان لێهەستاندووین کە بۆچی ناهێڵن خۆمان پاسەوانی خۆمان بکەین، بۆ ناهێڵن خۆمان لەنێو خۆماندا ڕۆڵە هەرە ئابڕوومەند و دڵسۆزەکانی خۆمان دیاری بکەین و ئەو ئەرکەیان پێ بسپێرین؟ مەگەر ئێوە پاسەوانتان ناوێن! لێبگەڕێن با ئەو پاسەوان و ئەرکدارانە لەنێو خۆماندا هەڵبژێرین، ئێمەش زۆرمان کەسانی نەخوێندەوار و برسی هەن.

کەسێک نییە گوێ بگرێت، دەوڵەت لە تارانەوە پاسداری بۆ ناردوون. گەنجی بەدبەخت و برسی و بێکاری لەژێر ناوی ڕزگارکەری ئیسلام و کۆماری ئیسلامییەوە بەبێ ئەوەی تۆزقاڵێک شارەزایی و ئاشنایییان بە کورد و کوردستانەوە هەبێت دێنە ناوچەکە. ئاغاش چاوەڕوانیی هەڵگیرسانی شەڕە، ئەو دەیەوێت پڕوشکی ئاگرەکە لێ بدرێت و شەڕەکە هەڵبگیرسێت تاکو سوپا گوێلەمستەکەی خۆی ڕەوانەی ناوچەکە بکات. تێکهەڵچوونەکە ڕوودەدات، ئاغا ئەوەی دەوێت و وا بەرنامەی بۆ داناوە.

***

## شەو گەیشتینە پیرانشار (خانە)

کاتژمێر دەی شەوە کە دەگەیینە پیرانشار. لەبەردەم چاخانەیەکدا ڕامان گرت. هەر کوردێک، لایدەیەک ببینێت و بزانێت کەسێکی خراپ نییە، هەر بە خۆی دێتە قسە و تۆ زۆر زەحمەت ناکێشیت بیهێنیتە ئاخاوتن. کاتێک چووینە نێو چاخانەکە، تەلەڤزیۆن ئیشی دەکرد و ڕێپێوانەکەی ڕۆژی سێشەممە (ڕێپێوانی یەکبوون) ی پەخش دەکرد.

چاچیەکە بە گاڵتەپێکردنەوە ئاماژەی بە تەلەڤزیۆنەکە کرد و گوتی:

"بە مێزەر و لە قومەوە میللەت بەڕێوە نابردرێت. ئەمانە وڵات تێک دەدەن و دواییش دەڵێن کورد وای کرد."

چاچیەکە درێژەی پێدا "بە قسان پێک نایەت و وڵات بەڕێوە نابردرێت، سەیرکە لاوەکانی ئێمە لەسەر دیوارەکان نووسیویانە:

'بە یەکبوونی قسە، وڵات دروست ناکرێتەوە، ئێمە پێویستمان بە یەکبوونی کردار هەیە.'

چایچی دیسان قسەی کرد:

"ئەمانە خۆیان تەنانەت یەکبوونی قسەشیان نییە. سەیرکە بە یەک وشە کە کردیان چوار پێنج ملیۆن سوننیان کردنە دژی خۆیان. ئەگەر ئەوەندە شیعە، شیعەیان نەکردبا ڕەوشەکە نەدەگەیشتە ئێرە."

ئێستا شیعە و سوننی بە جەهەنەم مەگەر ناڵێن موسڵمانین. سەیرکە ئەم قەندانە (قەندانێکی نیشانی ئێمە دا) پڕە لە قەند، هی هەموو ئێرانە، ئەگەرموسڵمانی، کەسێکی موسڵمان دەبێ یەکسان

ڕەفتار بکات. (ئەو لە بری وشەی یەکسانی دەیویست وشەی فیدراتیڤ بەکار بێنێت، بەڵام بەباشی نەیدەزانی دەری ببڕێت، گوتی فیدراتیڤ. ئێمە پێکەنین.) بەڵام واتاکەی باش دەزانی، چونکە قەندی نێو قەندانەکەی هێنایە دەر و بە شێوەیەکی یەکسان لەسەر مێزەکەی بەش بەش کرد و گوتی:

"ئەمە پشکی کورد، ئەمە پشکی فارس، ئەمە پشکی تورک و ئەمە هی..."

گەنجێک بەرامبەر ئێمە دانیشتبوو گوتی:

"کورد پشکی خۆی دەوێت، پشکی ورد خوراوە."

کابرای چایچی درێژەی بە قسەکانی خۆی دا:

"ئێمە ئار پی جی حەوتمان هەیە، چەکی دژە تانکمان هەیە، چەکی دژە فڕۆکەمان هەیە، شەستتیرمان هەیە و مەخزەنەکانی ئێمە پڕن لە تفەنگ،"

گەنجەکە گوتی:

"لەم سەردەمەدا تفەنگ بە کەڵکی چی دێت، ئار پی جی دە، ئارپیجی دە باش و کاریگەرە کە تانک دەشکێنێ. ئار پی جی دە بەرامبەر دەستەیەک دوژمن بتەقێنی هەموویان لەتوپەت دەکات."

ئەو گەنجە بە زەحمەت فارسی دەئاخوت، بەڵام وشەکانی بە دروستی دەردەبڕین. کە تەلەڤزیۆن هەواڵەکانی تەواو کرد، سەرۆکوەزیر لە سەر ئەکرانی تەلەڤزیۆن بەدەرکەوت و دەستی بە قسان کرد، یەکەمجار هەموویان بە وردی گوێیان لێگرت، زەینێکم هەر لەسەریان بوو کە بزانم کاردانەوەیان بەرامبەر بە سەرۆکوەزیر چۆن دەبێت. نەمزانی 'بازرگان'[1] چی گوت کە کابرای چایچی هاواری لێهەستا و بەرەو لای تەلەڤزیۆنەکە

---

١-مەهدی بازرگان ١٩٠٧-١٩٩٥یەکەم سەرۆکوەزیری ئێران دوای رووخانی رژێمی محمەدڕەزا شا.

ڕایکرد و مستێکی توندی پێدادا و کوژاندیەوە. "بێدەنگ بە، هەی دوژمنی کورد، بێغیرەت، دوژمنی کورد."

چایچی هەوڵی دا ئەو قسانەی بە فارسی دەرببڕێت تاکو ئێمە باش لە واتاکەیان بگەیـن. تـووڕەیی بە ڕوخساری هەموو کوردێکەوە دیار بوو، من شـەرمم لە خۆم دەکردەوە، سەری خۆم داگرتبوو، نەمدەتوانی سەیریان بکەم.

***

# بازاڕی چەکفرۆشان

ئەو کوڕانەی کە منیان لە بانەوە هێنایە پیرانشار، بە دوای کاری خۆیاندا ڕۆیشتن. منیش تا نزیکەی نیوەڕۆ لە هوتێلێک دانیشتم و یاداشتەکانم پاکنووس کردنەوە، ئێستا تا ڕادەیەک کوردستانم ناسیبوو.

لێرە ئیدی ناوی ئەو بەناو (عەلـلامە)یە کە پێی دەڵێن موفتیزادە و دارودەستەکەی نابیستین. لە بانەوە بەملایە ئیدی دەتوانم بڵێم کەس نییە ناوی بێنێت، بەڵام لێرە قیادە موەقەتە و چلکاوخۆرەکانی حەسەنی لە ناو شاردا هەستیان پێدەکرێت. سەربازخانەی "جەڵدیان" کە نزیکی شارە، پێگەی ئەو بەکرێگیراوانەی کۆماری ئیسلامییە. لێرە لەگەڵ ناوی ئایەتوڵلایەکی ملهوڕ بە ناوی حەسەنی ئاشنا دەبین و سەروکارمان لەگەڵیدا دەبێت. لە هەموو جێگایەکدا هەست بە بوونی دەکرێت. ئەو حەسەنییە ملهوڕە لای خەڵکەکە وەکو جەندرمەکان چەپەڵ و بێزراوە.

دوانیوەڕۆ کە هەوا فێنک بووبوو، پیاسەیەکم بە شەقامە سەرەکییەکەی شاردا کرد. لە پیادەڕۆکانی ئەو شەقامەدا چەک وەکو نان، کڕین و فرۆشتنی پێ دەکرا. لە ژێر سێبەری درەختەکان، لە پیادەڕۆکان، پیرەمێردە دێهاتییەکان کە دڵنیام هی سەر سنوور بوون لە کیسەی نایلۆندا کە پێ دەچوو پێشتر کیسەی نەبات بووبن، فیشەکی کلاشینکۆف، ژ٣ و بڕنۆیان دەفرۆشت. ئەگەر لە گەڕەکەکانی باشووری تاران گەڕابیت و کەلوپەلی وردەواڵەفرۆشەکانت بینیبێت کە شانەی سەر و تاخمی

ددانی دەستکردی چەندین جار بەکار هاتوو و تەسبیح و کتێبی دڕاویان دەفرۆشت، لێرەش بەزمێکی ئاوات دەبینی، بەڵام لێرە لە لای ئەم وردەواڵەفرۆشانە هەموو چەشنە ئامێر و ئامرازێکی چەکی ڕووسی و ئامریکی و ژاپۆنی و ئەڵمانی بەدی دەکران. دەرزیلەی تفەنگی ژ٣، باقەنەزمەی تفەنگی بڕنۆ، مەخزەنی نوێ و کۆنی تفەنگە بە هەیبەتەکانی کلاشینکوف، دەمانچەی کۆن (کە ئەگەر ئەنتیک ناسێکی بیانی ڕێی بکەوتبوایە ئەو ناوە، بە هەر نرخێک بوا دەیکڕین)، زەیت، زەیتی تایبەتی پاککردنەوەی تفەنگ، هی تایبەتی پاککردنەوەی باقەنەزمە، سمبادەی تایبەتی پاکردنەوەی خانەکانی لوولەی تفەنگی جوان و کاریگەری بڕنۆ، تاخمە و مەخزەنی برۆنزی، چەرمی، فیشەکدان، مەتارەی ئاو، خەنجەر، خەنجەری جۆراوجۆر، چەقۆ، نێزە، تەور، هەرچییەک بتوانی شەڕی پێبکەیت و ئازادی پێ بەدەست بێنی، دەبیندران. کڕیارەکانیش زیاتر دێهاتییەکان بوون. کاتێک بە لای وردەواڵەفرۆشەکاندا دەڕۆیشت و لایان دادەنیشی، دەبینی پیرەمێردەکان دانیشتوون و سەرقاڵی مشتومڕن لەسەر نرخی چەکێک. کابرایەکی دێهاتی کە خەریک بوو مامەڵەی بە مانگاکەی دەکرد بەرامبەر کۆنە بڕنۆیەک، دواجار بە تووڕەیی هاواری لێ هەستا:

"بۆ گرانت کردووە، کاتی شەڕی نەغەدە دەکرا بڵێی گرانیش بێ گرنگ نەبوو، بەڵام ئێستا کە شەڕ نییە، بۆچی گرانت کردووە؟"

فرۆشیارەکە دەیگوت: "لەم ڕۆژانەش هەر شەڕە بە کەمتر نایدەم."

دێهاتییەکە گوتی: "ئێستا کوا لەکوێ شەڕ هەیە؟"

فرۆشیار بە بێ بایەخدانەوە وەڵامی دایەوە "مەگەر پیاوەکانی حەسەنی نابینی کە دەروازەیان گرتووە؟"

دێهاتی پێداگری دەکات، فرۆشیار دانابەزێ. دێهاتیەکانی دیکە دێنە نێو مامەڵەکە و نێوانگری دەکەن و سەرەنجام برنۆیەکی کۆنی ژمارە یازدە دەدرێتە کابرای دێهاتی و دێهاتی کندری ملی گایەکی قەڵەو و تێرگۆشت دەداتە کابرای چەکفرۆش. پیرەمێردەکە قۆنداغی تفەنگەکە دادەنێتە سەر پێڵاوەکەی، باقەنەزمەی ڕادەکێشێ، فیشەکێک ڕەپێش دەکات، پەلاپیتکە دادەگرێ، گوللەیەک بە ئاسمانەوە دەنێت. فیشەکدانە چەرمییەکەی کە پێشتر کڕیویە لە پشتی خۆی دەبەستێ، فیشەکی برنۆیان تێدەهاوێ، تفەنگەکە بە شانی دادەدا و بە ڕوخسارێکی گەشەوە ملی ڕێگا دەگرێت و دەڕوات. کەمێک لەو سەرەوەتر گەنجێک کە تازە پێگەشتووە و سەر و سیمای تۆزاویە، دەمانچەیەکی ئەڵمانی خستۆتە بەرپشتێنی و حەوتخۆرێکی سوپاییشی بەدەستەوەیە و بە کوردی هەندێ شت دەڵێت، پیاوێکی دێهاتی چل و پێنج، چل و شەش ساڵی، بۆ لای دەڕوات، نرخی حەوتخۆرەکە دەپرسێت، فرۆشیار نرخێکی لە دەوروبەری پێنج هەزار تومەنی پێدەڵێت، کابرای کڕیار بە فیزێکەوە دەڵێت:

"دیارە شێتم کە (٥٠٠٠) تومەن بە حەوتخۆرێک بدەم، کەمێکی دیکەی دەخەمە سەر و دەچم (ژ٣)یەک دەکڕم."

فرۆشیارەکە ڕوخسارێکی ڕێزدارانە بەخۆیەوە دەگرێت و وەک ئەوەی بڵێت: 'تۆ (ژ٣)ت بۆ چیە، دەتەوێت بیبیتە شار و پاسەوانی بکەیت؟ تۆ لەنێو کێڵگە کار دەکەیت. دەتەوێت ژ٣ لەکوێ دابنێی، تۆ کە ئەو هەموو ئیشەت هەیە دەبێ شتێک بکڕیت بتوانیت لەبەر پشتی خۆتی بنێی.'

ئینجا دەمانچەکەی بەرپشتی نیشاندەدا و بە خێرایی دانەیەکیان لە کیفی خۆی دەردێنێ و دەیخولێنێتەوە و نیشانەیەک دەگرێت و بە خەیاڵ پەلاپیتکەکەی دادەگرێت و پلی

پێدادێنێ و دەڵێت:

"دەبینی چەند زوو، خێرا، بەڵام ژ۳ دەتوانی ئاوا بە خێرایی کارپێ بکەیت؟ مەگەر بە ژ۳ دەتوانی کاربکەیت؟"

کڕیارەکە پێکەنی و بە تیزەوە شتێکی گوت کە واتاکەی بەم شێوەیە بوو:

"پارە کوێری کردووی، دەڵێی بە ژ۳ ناتوانی کاربکەیت. کابرا ئەم دەمانچەیە لەو جۆرانەیە کە ئەڵمانەکان بۆ منداڵەکانیان دروستی دەکەن، بۆردی نییە، لە مریشکی بدەیت خۆی ناجووڵێنێ. (ژ۳)ت بینیوە؟ بۆردەکەت بینیوە؟..."

پیاوە فرۆشیارەکە لەو چەرچیە کۆنە کارانەیە کە دانامێنن. ئەگەر بهاتباو تفەنگی ژ۳ی بفرۆشتبان، دەتدی چۆن پێی هەڵدەگوت و چۆن باسی ژ۳ی دەکرد.

لەو پیاوەی دەیویست چەک بکڕێت پرسیم "ئەم چەکانە لە کوێوە دێنن؟"

گوتی: "دیارنییە، ئەمانە هەر یەکێکیان بگری خزم و پیاوی خۆیان لەودیو سنوورەوە هەیە، زۆرتر ئەو چەکفرۆشانە دوو لایەنن. مرۆ نازانێ ئێرانین یان عێراقین یان خەڵکی تورکیان، ئێستا لە شار هەم عێراقی هەیە، هەم تورکیایی، لێروکانە خزم و کەسوکاریان هەنە، دێن بازاڕی خۆیان دەکەن، پیاسەی خۆیان دەکەن، پاشان دەگەڕێنەوە و دەڕۆن.

لە تەنیشت چایەخانەکەی نزیک وردەواڵەفرۆشەکان، دەکەیەکی ڕۆژنامەفرۆشی هەبوو. گۆڤاری (تەهران مسەوەر-تارانی وێنەدار)، چەند وێنەیەکی کوردە چەکدارەکانی چاپ کردبوو و چاوپێکەوتنێکیشی لەگەڵ شێخ عیزەدین حوسێنی کرد بوو. ڕۆژنامەفرۆشەکە، گۆڤارێکی لێککردبووەوە و لای وێنەکانی بە جامی دەکەکەیەوە چەسپاند بوو. خەڵک کۆبووبوونەوە و سەیری وێنەکانیان دەکرد. پیاوێکی کەڵەگەت چوو گۆڤارێکی

کرێ و هات لە سەر نیوتەختەکانی چایەخانەکە لە تەنیشت مندا دانیشت. ڕەنگ بێت پێشتر منی نیشان کرد بێت. کوردی دیکەش هاتن دەوریان گرتم و ویستیان وتوویژەکەی شێخ عیزەدینیان بۆ بخوێنمەوە. پیاوەکە بەتایبەت بە فارسی گوتی:

"بوەستن، هەمووتان بوەستن."

ئینجا بە شێوەیەک کە من تێبینی کارەکەی بکەم، بە ئەسپایی لاپەڕەی گۆڤارەکەی هەڵدانەوە. ئەوانی دیکە بێئۆقرەتر بوون، دەیانگوت زووبە لاپەڕەکانی هەڵدەوە، ئەو هاواری بەسەرداکردن:

"بێدەنگ، قسە مەکەن."

هەموویان چاوەڕێ بوون ببینن دەیەوێت چی بکات. لاپەڕەی گۆڤارەکەی یەک یەک هەڵدانەوە، لە هەر لاپەڕەیەکدا وێنەیەکی ڕیشدار (جگە لە وێنەی شێخ عیزەدین) هەبووایە، جا وێنەی ئاخوند، یان هەر مێزەربەسەرێک بووایە، تفێکی تێدەگرت و دەیگوت:

"تفففف لە ڕیشت، تفففف لەو مێزەرەت."

هەموو ئەوانی دیکەی لەوێ بوون بە شانازییەوە سەیری ئەو ڕەفتارەی چایچییەکەیان دەکرد و حەزیان لەو بەزمەی دەکرد. لە لاپەڕەیەکدا ناوی مەلا حەسەنی هاتبوو، ئەو لاپەڕەیەی لێکردەوە و فڕێی دایە نێو قوڕ و چڵپاوەکەی بەردەم چایخانەکەیی و گوتی:

"ئەمە بە کەڵکی کورد نایەت."

لاپەڕەیەکیش وێنەی کارتەر[1]ی پێوە بوو. ئەو لاپەڕەیەشی بە وردی و تووڕەییەوە بە نووکی چەقۆ بڕی و لێیکردەوە و

---

-١جیمی کارتەر، لە دایکبووی١٩٢٤لە ساڵی ١٩٧٦ تا ١٩٨١سی و نۆیەمین سەرۆککۆماری وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا بووە.

هەڵیگلۆچاند و گوتی:

"هەمووی لەژێر سەری ئەو خوشک..."

ئەوانــی لەوێ بــوون خۆشــحاڵ بــوون. ئێســتا چەنــد پێشمەرگەیەکیش دەوری ئێمەیان دابوو. پیاوەکە کە خەریکبوو بە دوای ناوەکانــــدا دەگەڕا، وەک مریشــــک چـــۆن دان هەڵــدەگرێتەوە، دانە دانە ناوەکــانی مەبەســتی بــوون دیــاری دەکردن و بە نووکی چەقۆ لە گۆڤارەکەی دەکردنەوە و ئەوانی دیکەش لە دۆزینەوەی ناوەکاندا یارمەتیان دەدا.

ڕێوڕەســـمی 'تفکــردن'، 'لاپەڕەدڕانـــدن'، 'ســـەربڕین' و 'نــاولێکردنەوە' بە ســەرکەوتووی و شــانازییەوە کۆتــایی هــات. گۆڤــاری (تــارانی وێــنەدار) ئێســتا کــون کــون و پــارچە پــارچە بووبوو. دواجاریش چایچی گۆڤارەکەی هەڵدایە لای ئەوانی دیکە و گوتی:

"بگرن، ئێستا بوو بە گۆڤارێک کە بە کەڵکی کورد بێت."

خەڵکەکەی ئەوێ گۆڤارەکەیان لێوەرگرت و هۆرایان کێشا. کابرا سەیرێکی منی کرد و بە ڕێزەوە هەواڵی پرسیم. زۆر بە هێمنی وەڵامـم دایەوە. چـاوێکی لە ڕوخســار و ســەراپای قەد و قیافەم کرد، پاشان وەک بڵێی بەزەیی پێدا هاتبمەوە، پرسی:

"ڕێبواریت؟"

"بەڵێ ڕێبوارم."

بە چایچییەکەی گوت چام بۆ بێنێ. لەو ماوەیەی کە چایەکە هات، زۆر جیاواز لەوەی تا ئێستا بینیبووم. گوتی: "زۆر زوڵم لە کورد کراوە زۆزۆر."

ئەو کاتەی ڕێوڕەسمی تفکردن ئەنجام دەدرا وامزانی ڕەنگ بێت کرێکاری ڕۆژانە بێت، ئێستا کە بە هێمنی دەدوا پێدەچوو مامۆستای خوێندنگەیەک بێت.

"ئەم فارسانە، ئەم تورکانە زۆر خراپ دەرچوون، نەدەبوو

ئەوەیـان لەگەڵ ئـێمەدا کردبـا. ئێـوە سـەیر کەن لە نەغەدە ع کارەسـاتێکیان دەرهەق کـردین، کوردیـان لە شـار هێنـایەدەر، سـوپای کۆمـاری ئیسـلامی لەوێـدا تـاوانی ئەنجـام دا. ژنـانی دووگیانی ئێمەیان خستنە بەر رەحمەتی تفەنگەکانیان و لەپەنای تەرمـی ئەوانـدا سـەنگەریان بەرامـبەر ئـێمە گـرت، بەوە دڵـی کوردیان کون کون کرد.‟

‟کاکە ئەگەر لەجیاتی ئەمانە تورک و بەعسی و ئیسرائیلی و ئامریکایی بوایەن باشتر بوو. ئێمە لێرە لە گەڵ عەجەمان برا بووین. ئەو حەسەنی و داروودەستەکەی خەریکە ماڵوێرانی دێنێتە ئارا، بۆچی ئەو عەجەمانە بەر بە حەسەنی ناگرن؟‟

ئێسـتا دەزانـم کە مـامە سـام[1] سـەرکەوتووە. ئەو رق و نەفرەتەی کە دەیویست لە نێو گەلانی ناوچەکەدا دروستی بکات، دروستی کـرد، کـورد تورکەکـان بە تاوانبـار دەزانێـت، هـاوار دەکات کە تورکەکان دەستیان بە خوێنی ژنانی ئێمە ئاڵوودەیە. تورکەکـان کـورد تۆمەتبـار دەکەن، مـام سـام ئاغـای هەمـوو ستەمکارانە دیسان سەرکەوتووە.

ئێسـتا قیـافەی پیـاوەکە بە تەواوی قیـافەی مامۆسـتایەکی ئازارچەشـتووی پێـوە دیـارە، لە میـانی قسـەکانیدا تێـدەگەم کە مامۆسـتای گونـدەکانی سەردەشـتە. ئێسـتا کە تێگەیشـتووە پـێم خۆشـە لە بـارەی کـوردەوە شـتی زیـاتر بـزانم، ئەو حـاڵەتەی هەڵچوون و تووڕەییەی پێشتری نەماوە و بە شێوازێکی رەوان و رێزمانی قسەم لەگەڵدا دەکات:

‟پاسدارەکانی حەسـەنی، دژی گەل و تـاڵانکەرن، ئەوان پـارە وەردەگـرن کە مـرۆڤ بکـوژن. سـوپا دژی گەلە، ئەوەمـان بە خـوێنی رۆڵەکـانی خۆمـان بـۆ سـاغ بـۆتەوە. ڕادیـۆ درۆ دەکـات،

---

[1] -مەبەستی ئامریکایە

فاشیستییە، کورد ئازار دەدات.'
ئەو کاتەی گۆڤارەکەی هەڵدەدایەوە جنێوی بە کاربەدەستانی قوم و ڕێبەرەکان دەدا، بەڵام ئێستا لەبارەی قوم و ڕێبەرەکان و دەوڵەتەوە لێی دەپرسم، دەڵێ:
'شتێکی ئەوتۆیان لە بارەوە نازانم، نایانناسم، ئەوانیش کورد ناناسن.'
'دەوڵەت دەبێ ئەوە بزانێ تەنیا بە شێوەیەک دەتوانێت لە دەستی کورد دەربازی ببێت، کە سەرتاسەری کوردستان بکاتە یەک پارچە ئاگر و ئاسن. بۆمببارانی بکات. کاکە ئێمە بە دەنگی بەرز گوتومانە و دەیڵێین خوازیاری شەڕ نین. کوردێک نادۆزیتەوە بیەوێت شەڕ ڕووبدات، ئێمە گەرەکمانە ئەو کێشەیە لە سەر مێزی گفتوگۆ، لە ڕێی وتووێژەوە چارەسەر بکرێت، ئێمە شەڕمان ناوێت، بەڵام ئەگەر بەسەرماندا بیسەپێنن خۆ چارەیەک نامێنێتەوە..'
'زوڵم لە کوردستان کراوە، کورد هیچ شتێکی نییە، لەم پیرانشارە لە جێی کارخانە و پڕۆژە، سێ دانە سەربازگەیان داناون. ئێمە لێرە دکتۆرێکمان نییە. من لەبارەی دێهاتەکانەوە قسە ناکەم، هەر سەبارەت بەم شارانە قسەت بۆ دەکەم، کە بە چاوی خۆت دەیانبینی. ئەم پیرانشارە و سەردەشت و شنۆیە. ئەگەر منداڵێکمان نەخۆش بکەوێت دەبێ بە تەمای خوا لێی بگەڕێین. خۆتان بە چاوی خۆتانەوە بینیتان. نە ڕێگامان هەیە، نە ئۆتومبێل، نە توانایەک... ئێوە مافی کورد نادەن.'
پاشان ئاماژە بە بازاڕی وردەواڵەفرۆشەکان دەدات و دەڵێت:
'ئەو برە پارەیەش کە بە هەزار بەدبەختی و کوێرەوەری بە دەستی دێنین، دێین لێرە بە چەکی دەدەین.'
پیاوێکی دێهاتی نیشان دەدات: 'ببینە، قیافە و ژیانی ئەو پیاوە سەد تومەن ناهێنێت، بەڵام ناچارە بەهەر بەدبەختییک بێت

دەمـانچەیەک بکرێـت، دەبـێ بیکرێـت لەبەر ئەوەی پیاوەکـانی حەسەنی دێن گەنمەکەی لێ دەسووتێنن."

چەند پێشمەرگەیەک نیشـان دەدات: "سـەیریان کە، هەموویان هەوڵ دەدەن تفەنگـی برنۆیـان هەبێـت، چـونکە دەزانـن دواجـار دەوڵەت لە ڕێگەی ئاسمانییەوە پەلامارمان دەدات، برنۆ دەتوانێت هێلیکـۆپتەر و فـڕۆکەش ئەگەر نـزم بێـت بپێکێـت. دەیـانبینی هەموویان نیگەرانن. بۆچی ئێمە نابێ لە سـەر خـاکی خۆمان، لە وڵاتـی خۆمـان، لە ئێـران ئـۆقرەیی و ئاسایشـمان هەبێـت! هەر لەبەر ئەوەی گوتومـانە نانمـان دەوێت، نـانی خۆمـان، دەرمانمـان دەوێت، کارمـان دەوێت. ئـێمە نـاڵێین سـینەمامان بـۆ بـکەنەوە، داوای ژیـانێکی خۆشـگوزەرانمان نەکـردووە، پارکمـان ناوێـت. دەرمان، دەرمانمان دەوێت، خوێندنگەمان دەوێت، زمانی خۆمان دەوێت.. داواکردنـی ئەم شـتانە کـوێی تـاوانە!. گەلـی کـورد کەی توندوتیژی ویستووە؟ کێ جوداخوازە؟ ئەگەر بیانەوێت تەنانەت بە خـورتیش لە ئێرانمـان جیـا بـکەنەوە، ئـێمە نامانەوێـت. ئـێمە کوردسـتانمان لە چوارچێـوەی نەخشـەی ئێرانـدا دەوێـت. ئـێمە پشکێکی گەورەمـان لە مێژووی خەبـات و گیانبازییەکانی ئێراندا هەیە، سـەلاحەدین و کەریـم خـانی زەنـدمان هەیە. ئەمـانە هەموویان ئێرانین. لە هەموو جێگایەکدا زوڵـم لە کـورد دەکرێـت. بۆ نموونە ببینە ئەو (سیاهکەل[1])ە، ئێستا هەموویـان سـیاهکەل و

---

١-سیاهکەل یەکێکە لە شارۆچکەکانی سەر بە پارێزگای گەیلانی باکووری ئێـران. ڕووداوی سـیاهکەل یـان چـالاکی گیانفیـدایی گروپێـک لە پارتیزانەکانی ڕێکخراوی جریکە فیداییەکانی گەلی ئێران بۆ سەر پاسگای ژاندەرمەری ئەو شوێنە کە دەگوترێت بۆ ئازادکردنی یەکێک لە ئەندامە دەسـگیرکراوەکانی ئەو ڕێکخـراوە بـووە، لەو دەرگیـرییەدا کۆمەڵێـک لە پارتیزانەکان دەکوژرێن و ئەو ڕووداوەش بە ناوبانگێکی گەشەوە دەچێتە نێو لاپەڕەکانی تێکۆشانی چەکداری چەپەکانی ئێران

شەهیدە قارەمانەکانی ئەو ڕووداوە گەورەیە بە باشی دەناسن و دەزانن. ئێمەی کوردیش هەموویان دەناسین و شانازیان پێوە دەکەیــن، بەڵام ئــێمە خۆمـــان ســــیاهکەلەکانمان لەو کێـــو و بەنـدەنانەی کوردسـتان خسـتوونەتە سـەرپێ، سـەدان شـەهیدی قارەمانمــان داوە. قارەمانــانی وا کە لە نێـو خەڵـکەوە ســەریان هەڵدا، بەڵام نەیانهێشت هیچ کەس بیانناسێت. گەلانی دیکە نازانن کە کورد چی کردووە و ئێستاشی لەگەڵدا بێت چی دەکات."

بەردەوامە لەقسەکردن، هێواش هێواش تێدەگەم کە یەکێکە لە ئەنــدامانی حیزبــی دیمــوکرات. ئەو پێــی وایە ئەگەر حیزبێــک بتوانێـت لەو نـاوچەیە سـەرکەوتوبێت، ئەوا حیزبـی دیمـوکرات دەبێت. کە پێی دەڵێم لاوانی ڕۆنشنبیری کورد دڵیان بەو حیزبە خۆش نییە و ڕێبەرانی ئەو حیزبە بە هەلپەرست دەزانن و دەڵێن ئەوان تەنیا بیر لە دەسەلات دەکەنەوە، هەڵدەچێ و دەڵێت:

"وانییە، ئێوە بەهەڵەدا چوونە، ئەوانیش بەهەڵەدا چوونە."

کاتێـک دەڵـێم کە لاوەکــان حیــزب تۆمەتبــار دەکەن بەوەی پرسەچینایەتییەکان دەرک ناکات و ئەندامەکانی ڕاناهێنێت لەسەر هۆشیاریی سیاسی. دیسـان هەڵدەچێ: "ئەم قسـانە ڕاسـت نین، ئـێمە ئێسـتا خەریکـین لە چیاکانـدا پێشـمەرگەکان ڕادەهێنـین و مەشــقیان پێـدەکەین. ئـێمە خەریکــین خەڵکەکەمــان هۆشــیار دەکەینـەوە، هێزەکانمـان ڕادەهێنـین و مەشـقیان پێ دەکەیـن. بە دەمـارگرژییەوە قسـەکانی دەکـات، بەڵام کاتێـک ئەم قسـانە بـۆ خوێنـدەوارەکان دەکەیـت، تـۆ بەوە دەبەسـتنەوە کە: "ئەمە تەنیـا حیزبێکی ڕیفۆرمخوازە. چارەکە سەعاتێکیش ئەندامەکانی ناخـاتە نێو پەروەردە و فێرکردنەوە. ئەگەر مەشق و ڕاهێنـانێکیش هەبێ بە دڵنیــاییەوە ســــنووردارە و تەنیــا لە بــواری کـــاری

پێشمەرگایەتییەوە و بەس.

لەگەڵ مامۆستا پیرانشارییەکە بەنێو شاردا پیاسەمان کرد و سەرمان لە کۆڵانەکان دا و چووینە دوکانێکی شووتی فرۆشی و شووتییێکمان کڕی و لە پشت مێزێک دانیشتین و پێکەوە لەگەڵ ئەوانی دیکە شووتیمان خوارد.

***

## وای لێ بێت کورد بەرگە ناگرێت

دیسان بە ڕێگایەکی خۆڵ و پڕ پێچ و پەنادا تێدەپەڕین. دیسان دەبینین وا ژنان و پیاوان خەریکی کارکردنن. لێ ئەمجارە کرێگرتەکانی حەسەنی بە بەر چاوی خەڵکەکەوە دەیانپشکنن و بە دوای چەکدا دەگەڕێن و ناهێڵن چەک لە شار ببردرێتەدەر. خەڵکی کورد هاواریان لێ هەڵساوە:

'ئەو بێگانانە چیان لە گیانی ئێمە دەوێت؟!'

فەرمان دێت کە: 'بێدەنگ بن ئەمانە پارێزەرانی قورئان و سەربازانی (ئیمامی زەمان[1])ن. ئێوە وس‌بن، ئێوەی کورد چ دەزانن کە پارێزگاریکردن واتە چی. با وای لێ بێ ئەمانە ژیانتان لێ وەتەنگ بێنن، قسە نەکەن، بێدەنگ بن.'

کورد هاواریان لە قورگیاندا گیر دەخوات کە:

'ئەمانە کوێیان پارێزەری قورئانن. ئەمانە چین تاسەربازی ئیمامی زەمان بن. ئەمانە لۆتی و پۆتین کە لە دێهاتەکاندا گەودایان دەکرد، ئەمانە تەنیا بۆ پارە ئەم کارە دەکەن، بۆچی تاقمێک لۆتی و پۆتیان بەسەر ئێمەدا کردوۆتە کەڵەگا. ئەو حەسەنییە ئەو هەموو پارەیە لە کوێ پەیدا دەکات کە دەیداتە ئەمانە؟'

هاواری کوردەکان ناگاتە هیچ کوێیەک:

'بۆچی کەس گوێ لە قسەی ئێمە ناگرێت، بە خوا، بە

---

[1]-لای شیعەکان بە مەهدی دوازدەمین ئیمامیان دەڵێن ئیمامی زەمان

محەمەد، بە قورئان، بەعەلی، خەریکن ئەم مەملەکەتە ویران دەکەن. بە خوا...'

بە ڕاستی دەهری دەبیت، لە خۆت بێزار دەبیت کە ئەم قسانە دەبیستی. ئەوانەی قوم هیچ کامیان شتێک لە بارەی کوردستانەوە نازانن. ئەو بیانیانە چۆن دەزانن کوردستان لە کوێیە و کورد چ کێشە و ئێش و ژانێکی هەیە. ئێستا دەتوانم زات بدەمە بەر خۆم و هاوار بکەم کە نەک تەنها ئەوانەی قوم بەڵکو وەک پێویست هیچ کەس کورد ناناسێت. بۆ ناسینی ئەوان دەبێت بگەڕێیت، بچیتە نێو کێڵگەکان، گرد و تەپۆلکەکان، چیاکان، ڕێگاکان و دەشتەکانی ئەوان ببینیت، ئەوان کە ساڵەهای ساڵ لە دەرەوەی وڵات ژیاون، خراپتر لە هەمووی جگە لە چوارچێوەی وشکی شیعەبوون ناتوانن شتێکی دیکە ببینن. ئەوان کە خۆیان بە سەربازانی ئیمامی زەمان دەزانن، لەوەی کە خوێنی کورد بڕێژن، لە بەرانبەر خوادا هەست بە شەرمەزاری ناکەن، بەڵکو ئەوا چۆن بتوانن تێبگەن کە کورد چی دەوێت. کە ئاوای لێهات ئیدی کورد بەرگە ناگرێت.

***

# دەچینە نێو شنۆ

بەنێو دەشتێکی پڕ لە دڕک و ئوستریدا تێدەپەڕین و دەچینە نێو شنۆ. لێرەش وەکو سەردەشت و بانە و پیرانشار دەردەکە هەمان دەردە، بەڵام لێرە قیادە موەقەتییەکان لەنێو شاردا بە شێوەیەکی ئاشکرا دەسووڕێنەوە و بۆ خۆیان بنکە و بارەگایان کردۆتەوە. تایبەتمەندێتی ئەم شارانە ئەوەیە، گەنجەکان زۆر ئاسان بەرەو ڕووت دێن و دەتبەنە نێو خۆیان. لە هەموو کوردستان بۆ ساتێکیش هەستم بە تەنیایی نەکرد، گەنجەکان لە هەموو جێگایەکدا لەگەڵم بوون. ئەوان منیان لەگەڵ خۆیان دەبردە نێو دۆست و خانەوادە و ژیانی خۆیان. مرۆڤگەلی تا ئەو ڕادەیە میهرەبان و بەڕێزم نەبینی بوون. ئەوان لەگەڵ کەسێکی بیانی، زۆر ئاسایی و خۆمانە هەڵسوکەوت دەکەن. تۆ هێشتا سەعاتێکی پێناچێ گەلێ دۆست و ئاشنا لەنێو شاردا پەیدا دەکەیت. هەر کە ئێوارە دادێ و خۆر ئاوا دەبێت، بە کۆمەڵ لەگەڵ ئەواندا بەنێو شاردا پیاسە دەکەیت، ئەوان بە جۆرێک ڕەفتارت لەگەڵدا دەکەن کە تۆ وادەزانی چاوەڕێیان کردوویت و لەوێ جێگات خاڵی بووە و تۆ یەکێک بوویت لەوان و بۆ سەفەرێک چوویت و ئێستا گەڕاویتەوە.

بەڵێ لە شنۆییدا زۆر سادە تێکەڵی گەنجان بووم.

"بەخێر بێیت، لەکوێوە هاتوویت..."

"نازانم، لە پیرانشار، سەردەشت، بانە، مەریوان، لە...."

"لەوان دەڤەران چ باسە؟"

"وەک یەکێک لە هاوڕێ بانەییەکانم دەیگوت 'کوردستان بە دیموکراسییەوە دووگیانە.'"

"لای ئێوە چ باسە؟"

"لە هەموو جێگایەک بگرە و بەردەیە، دێوەزمە هەڵنیشتۆتە سەر سنگی خەڵک. لە شارەکان، شارەکانی وەکو ئەم شارەی ئێمە کە زۆری لێن، خەڵکی داریان بە دەستەوەیە و دەیکێشن بەسەر ئەو کەسانەی کە تێدەگەن. ناکۆکی کەتۆتە نێو خێزانەکان، تەبایی و هاوسۆزیان تێکچووە، باوکان کەوتوونەتە گیانی کوڕەکان، براکان دژی یەکدی پیلان دەگێڕن. ئامریکاییەکان نەخشەی وایان بۆ کێشاوین کە کاریگەرییەکەی گەیشتۆتە کونجی ژوورەکانمان، ئەمە بۆتە بەڵایەکی گەورە."

گەنجەکان لە کار و چالاکییەکانی خۆیان ئاگادارم دەکەنەوە. ئەوان بۆیان باس کردم کە خەریکن چ کارێک دەکەن. دێهاتییەکان تا چ ڕادەیەک پێشوازیان لێ کردوون، کرێکارانی کشتوکاڵ چەندە کاری باشیان کردووە، منداڵانی خوێندنگەکان بە هۆی کتێب خوێندنەوە و ئاشنابوون بە کتێب چەند پێشکەوتوون، ئاوا بە دەم قسەکردنەوە لە چەند بازاڕێکی وردەواڵەفرۆشی ڕەت بووین. ئێرەش وەکو پیرانشارە. پرسیم ئەو هەموو چەکە لە کوێوە دێنن بۆ فرۆشتن، گوتیان:

"چەکێکی زۆر لە سنوورەوە دێت، بەڵام زیاتر تفەنگە (ژ٣)یەکان لە تارانەوە دێن. چەرچییەکان ئەم چەکانە بە نرخێکی هەرزانی سێ چوار هەزار تومەنی لە تاران دەکڕن و دەیهێننە ئێرە و بە چەند بەرامبەر دەیفرۆشنەوە. بێجگە لە چەرچییەکان ئێمە خۆشمان کەسانێکی زۆرمان لە شارەکانی دیکە بەتایبەت تاران هەن کە چەکمان بە نرخی هەرزان بۆ دەکڕن و بۆمان ڕەوانە دەکەن. ئەمانە هەر ئەو چەکانەن کە لە کاتی پەلاماردانی سەربازگەکانی تاران کەوتنە دەستی خەڵکی."

شەو لە ماڵی یەکێک لە کوڕەکان بووم. چەند تەلیسی پڕ لە فیشەکی ژ٣ی نیشان دام و گوتی:

"ئەمانە هاوڕێ تارانییەکانمان بۆیان ناردووین. هەر ئەو هاوڕێیانەی کە لە زانکۆ پێکەوە دەمانخوێند. ئەو ڕۆژانەی کە بۆ دیداری ئێمە دێن، دیاریمان بۆ دێنن، دیارییەکەش فیشەک و تفەنگ و نارنجۆک و هەرچی دەستیان بکەوێت، بۆمان دێنن. ئێمە هاوڕێ و دۆستی باشمان لە شارەکانی دیکەدا هەن، لێرە فیشەک زۆر گرانە، تفەنگی باش نرخەکەی زۆر لە سەرەوەیە."

شنۆش وەکو شارەکانی دیکە بچوک، لاپەڕگە و بێ دەوا و دکتۆر، دوو شەقامی سەرتاسەری کە بە بیست خولەک دەتوانی لەم سەر بۆ ئەوسەری ببڕی، ئەمانەش وەکو هەموو شارە کوردییەکانی دیکە، منداڵانی خوێندنگە هاوینان پەشمەک و شەربەتی ئالوبالو و کاڵەک و ئاروو دەفرۆشن. لە مەودای دە مەترێکدا لانیکەم، پێنج مێرمنداڵ دەبینی کەوڵوکاسی خۆی ڕاخستووە و پەرداخی بە پێنج ڕیال دەفرۆشن. پاسەکانیش بەردەوام دێهاتییەکان بۆ شار دێنن و دەیانگەڕێننەوە.



## هەر کەس ستەم لە کورد بکات،
## کاک محەمەد دەیکوژێت

تا ئەو دەمەی تاریک داهات لەگەڵ گەنجەکاندا لەنێو شاردا پیاسەمان کرد، پاشان لە کەنار شار لەسەر ڕووبار دانیشتین، پێکەوە قسەمان کرد. دوای ماوەیەک کوڕەکان باسی 'کاک محەمەد' ناوێکیان دەکرد کەوا خەریکە دێت، گەنجەکان تکایان لێ کردبوو تاوێک بێتە لای ئێمە دابنیشێت.

کاک محەمەدم نەدەناسی. ئێستا دەمێکە هاتووە و وردە وردە خەریکە بیناسم. لە دوورەوە کە بینیم قەد و باڵایەکی بەرز و پاڵەوانئاسای هەبوو. جامانەیەکی پان و پۆڕی لە سەربوو و پۆتینێکی کۆنەی لە پێ بوو. دەمانچەیەکی لە قەدی بەستبوو و چەند رەختی فیشەکی راستو چەپ لە خۆی ئاڵاندبوون. سمێڵێکی گەورە و بابڕی هەبوو، هەموویان بە ڕێزەوە لەبەری هەستان. لەبارەیەوە لە گەنجەکانم پرسی، گوتیان:

"تەنیا دەتوانین ئەوەت پێبڵێین کە هەموو جەندرمەکانی کوردستان دەیناسن و وەک سەگ لێی دەترسن، کاک محەمەد قاندرِی جەندرمانە، سنوور و منووریش ناناسێ"

کوڕەکان پێیان گوتبوو میوانێکی فارسمان هەیە و بە پێداگرییەوە بۆیان ڕوون کردبووەوە کە ئەو میوانە، کوردی خۆشدەوێت و داوایان لێ کردبوو بێتە لامان و تاوێک لەگەڵمان دابنیشێت و بەتایبەت بۆ مێوانەکە بە فارسی قسە بکات.

کاک محەمەد بۆلای ئێمە هات، کاتێک کوڕەکان منیان

پێناساند، له‌ به‌رامبه‌رم ڕاوه‌ستا و ده‌ستی خۆی درێژکرد. خۆم له‌ به‌رانبه‌ر ئه‌ودا وه‌ک جووجه‌ڵه‌یه‌ک ده‌بینی که‌ هه‌ڵۆیه‌ک به‌ بان سه‌رییه‌وه‌ بێت، ته‌وقه‌م له‌گه‌ڵدا کرد. له‌ ته‌نیشتم دانیشت. هه‌مووما‌ن له‌سه‌ر عه‌رزه‌که‌ دانیشتبووین. کاک محه‌مه‌د فارسیه‌کی شه‌ق و شڕی ده‌زانی. کوڕه‌کان قسه‌کانی ئه‌ویان وه‌رده‌گێڕا، کاک محه‌مه‌د شازده‌ ساڵ له‌ ده‌ره‌وه‌ی ئێران بووه‌. کاتێک له‌نێو کوڕه‌کاندا دانیشت ئه‌و له‌ دره‌ختێکی ڕه‌گداکوتاو ده‌چوون و ئێمه‌ش وه‌کو نه‌مامێک ده‌هاتینه‌ به‌رچاو. کاک محه‌مه‌د ده‌ستی به‌ قسه‌ کرد بۆمان. مستی خۆی قوچاندبوو و هێنایه‌ پێش و به‌وپه‌ڕی ئازاره‌وه‌ گوتی:

"کاتێک له‌ ئێوه‌ دوور بووم و لای ئێوه‌ نه‌بووم، دڵم ئاوا وه‌کو ئه‌م مسته‌ گیرابوو، دڵته‌نگ بووم."

تنۆکێک ڕۆندک له‌ چاوه‌ درشت و ڕه‌شه‌کانی کاک محه‌مه‌د قه‌تیس مابوو، درێژه‌ی به‌ قسه‌کانی دا:

"ئێستا که‌ هاتوومه‌ته‌وه‌ نێو ئێوه‌، دڵم کراوه‌ته‌وه‌، خه‌م و خه‌فه‌تم نه‌ماون." هه‌موویان چاویان ته‌ڕبوو و فرمێسک زابووه‌ چاوه‌کانیان. سنووره‌کانیان گرتبوون. جه‌ندرمه‌کان له‌ پشت سیمی خاردار به‌ڕیز وه‌ستابوون و نه‌یانده‌هێشت که‌ کاک محه‌مه‌د له‌ سنوور بپه‌ڕێته‌وه‌ و بێته‌وه‌ شنۆی زێدی ئازیزی خۆی. شازده‌ ساڵ دڵی وه‌کو مستی چۆن گرتووه‌ ئاوا گیرابوو.

کاک محه‌مه‌د به‌ هه‌موو ئه‌و گه‌وره‌یی و هێز و بڕسته‌ی هه‌یبوو، وه‌ک منداڵێک ساده‌ و بێگه‌ردبوو. ئه‌و له‌گه‌ڵ شه‌ڕی نه‌غه‌ده‌ ده‌گاته‌وه‌ ئێران و له‌وێدا ئازایانه‌ به‌رگری ده‌کات و تا دواسات ده‌جه‌نگێ. کاتێک سوپا، کورد له‌شار وه‌ده‌رده‌نێن و ئیدی هیچ که‌س له‌ شاردا نامێنێت، ئه‌و هێشتا خه‌ریکه‌ له‌گه‌ڵ دوژمن شه‌ڕ ده‌کات، چه‌ند تانکێک ڕاوی ده‌نێن.

کاک محه‌مه‌د به‌ پێکه‌نین و ساده‌ییه‌که‌یه‌وه‌ بۆی باس

دەکردین کە:

"کاتێک پێنج تانکی ئاریامیهر[1]یان خستنە دوام"

ئەو سوور بوو لەسەر ئەوەی سوپا بە سوپای ئاریامیهر ناو ببات.

"سەیری دەوروبەری خۆم کرد. بینیم هیچ دەرفەتێک بۆ ڕاکردن نەماوەتەوە، بە خۆم گوت، ئاغای محەمەد، کۆتایی تەمەنتە، کارت لە کار ترازاوە. تۆ بەم تفەنگە، بە بێ دژە تانک، بە بێ بازوکا[2] چۆن دەرقەتی ئەو تانکانە دێیت!"

کاک محەمەد کە قسەی دەکرد هەم خۆشحاڵ بوو، هەم تووڕە. بەردەوام بوو:

"هەروا کە ڕامدەکرد گەیشتمە لای درەختێک، نزیک درەختەکە، چاڵێک هەبوو، سەراوسەر خۆم فڕێ دایە نێو چاڵەکە."

کاک محەمەد دەیگوت جگە لەو هیچ کەس لەو ناوە نەمابوو. هەموو کورد دابوویە چیا. کاک محەمەد خەفەتی دەخوارد کە لەو دەمەدا دژە تانک یان بازوکا یان شتێکی پێ نەبوو کە تانکە ئاریامیهرییەکان هەپروون بە هەپرووون بکات. بەردەوام بوو لە قسەکردن:

"کاتێک خۆم هەڵدایە نێو چاڵەکە، تانکەکان نەیانتوانی بمدۆزنەوە، بەڵام خەفەتم دەخوارد کە شتێکم پێ نییە شەڕی پێ

---

١-ئاریامێهر نازناوی محەمەدڕەزا شای پەهلەوی بوو، بە سوپاکەشی دەگوترا ئەرتەشی ئاریامێهر.

٢-بازوکا، چەکێکی دژە تانکە کە بە تاکە کەسێک هەڵدەگیرێ و دەتوانرێت بەکار بهێندرێت، ئەو چەکە لە شەڕەکانی ڕابردوو ڕۆڵێکی باشی هەبوو لە شەڕی دژ بە تانکدا، بەڵام بۆ ئەم سەردەمە چەکی باشتریان با بڵێین ئەو چەکە پێشکەوتنی زیاتری تێدا کراوە و ئێستا بازوکا بایەخی جارانی نەماوە.

بکەم. بە تفەنگێکی سادە چ نەدەکرا."
بروسکەیەک لە چاوەکانی کاک محەمەد هەڵسا و ئێمە وا هەستمان کرد بیەوێت شتێکی سەرنجڕاکێش و گرنگمان بۆ بگێڕێتەوە. کۆخەیەکی کرد و درێژەی پێدا:
"تانکەکان کاتێک بینیان کەس لە ناوچەکە نییە، ڕاوەستان، ئا لەو کاتەدا دەریچەی تانکەکە هەڵدرایەوە و ئەفسەرێک سەری هێنایە دەر و نەڕاندی:
"ئەو کورد خوشک.... ئەی کوان بۆ کوێ رایانکرد...؟"
کاک محەمەد دەنەڕێنێ کە:
'کورد لێرەن..'
کاک محەمەد وەک ئەوەی ئێستا لەنێو چاڵەکە بێ و ئێستا بێ ئەفسەرەکە ئەو جنێوانە بدات، دەستی دایە چەکی یەکێک لە گەنجەکان، جووڵەیەکی کرد، ئەژنۆی دانایە سەر عەرزەکە، سێرەی تفەنگەکەی لەنێو هەردوو چاوەکانیدا رێکخست، پەلاپیتکەکەی داگرت و لەپڕ هاواری کرد. مێشکی ئەفسەرەکە بە هەوادا پژا.
کوڕەکان لە خۆشحاڵیدا هاواریان کرد. کاک محەمەد تفەنگەکەی دایەوە خاوەنەکەی و لە شوێنی خۆی دانیشت. ئارەقە بەنێو چاوانیدا دەهاتە خوار. هێواشۆکە، بەڵام تووڕە لە ژێر لێوەوە گوتی:
"مێشکیم هەپروون بە هەپروون کرد. کوردەکان وا لێرەن، لێرە."
کاک محەمەد هەموو تەمەنی خۆی لەچیاکاندا بردبووە سەر. جگە لە شەڕکردن لەگەڵ دوژمن هیچ کارێکی دیکەی نەدەزانی.
"کاک محەمەد خوێندەواریت هەیە؟"
"خوێندەواریی خوێندنەوە و نووسین نا، خوێندەواریی چەکم هەیە، چیاکان دەناسم، جەندرمە دەناسم."

"کاک محەمەد چ کارێک دەکەیت؟ بۆ دابینکردنی بژێویت پارە لەکوێ پەیدا دەکەیت؟"

"کارم ئەوەیە هەر کەسێک زوڵم لە کورد بکات بیکوژم. خواردن و خۆراکیش هەرچییەک بوبێت تا ئێستا پێکەوە خواردوومانە. ئێمە هیچ کات شتێکمان نەبووە. لە چیاکان ڕاو دەکەین. نانمان دەگاتێ، هەمووومان پێکەوە لەسەر خوانێک دەخۆین، دواتر کە ئەوەمان خوارد هیدیکە دێتەوە جێی. ڕاو لە چیاکان هی خەڵکی چیاکانە."

"کاک محەمەد لە ژیاندا چیت هەیە؟"

بە پێکەنینەوە گوتی:

"کورد لە دارەتی دونیا هەر ئەوەندەی هەیە کە بتوانێت لەگەڵ خۆیدا هەڵیبگرێت و بیخاتە سەر پشتی خۆی و ئینجا بچێتە شەڕ یان ئاوارە ببێت، یان ١٠٠دانە جەندرمە بە تفەنگەکەی بە دوای خۆیدا ڕاکێشێتە سەر چیاو لە ژێر ئاگری گوللەدا ئاودیوی سنووربێت."

بە دەست ئاماژەیدا و گوتی:

"تەنیا هەر ئەوەندە."

بەیانییەکەی بیستم لە هەموو لایەک باس باسی ئەوە بوو کە (کوردی مەریوان شارەکەیان چۆڵ کردووە.)

بە سەرسورمانەوە پرسیم: "بۆچی، چۆن؟!"

زۆر سادە دەیانگوت:

'دەوڵەت زۆری بۆ هێناون کە پاسگا لەوێ دابنێت و جەندرمە بهێنێتەوە شار ئەوانیش لەبەر ئەوەی نایانەوێت لەگەڵ ئەم حکومەتەدا بەشەڕ بێن هەموویان بە شەو دەستی منداڵەکانیان گرتووە و شاریان بۆ حکومەت جێهێشتووە و خۆیان داویانەتە کێو و دەشت.'

ئێستا قسەی کاک محەمەد تێدەگەیشتم.

کاک محەمەد دیسان قسەمان بۆ دەکات. کوڕەکان پرسیاری زۆریـان هەیە، پرسـیار لە بـارەی چـۆنیەتی شـەڕکردن، چـۆن بەرگری بکەن و لە کاتی پێویست چۆن پاشەکشە بکەن؟

کاک محەمەد ئێستاکە دەربارەی شەڕکردنەوە قسە دەکات، قیافە و سیمایەکی دیکەی هەیە، بەڵام ئەوەی بە بیـرە کە ئێـرە چیا نییە و ئەم گەنجانە لە جیاتی ئەوەی تەمەنێکیان لە چیاکان بەسەر بردبێت لە پشتی مێـزی خوێنـدنگەیان بـردوەتە سـەر. دەست دەداتە تفەنگ و بە هێز، بەڵام بە ئارامییەوە ڕێگا نیشانی گەنجەکان دەدات. تفەنگەکە بەرز دەکاتەوە، دەنگی تێکەڵی دەنگی ڕووبارەکە دەبێت:

"تفەنگ ئابرووی ئێمەی کوردە..."

کوڕەکان لێیەوە ڕاماون "...کورد مافی خۆی دەوێت"

"بە تفەنگ ئەو مافە دەستێنێت."

ئاماژە بە گەنجەکان دەکات:

"بەم گەنجانە ئەو مافە بەدەست دێنێت."

گەنجەکان هێز و ورە لەو قسانەی ئەو وەردەگرن

"هـیچ کەس مـافی کـورد نـادات، خۆمـان بە دەسـتی خۆمـان وەریدەگرین"

کـاک مـحەمەد بەردەوام دەبێت.. مـن هەر خەریکم بیـر لەوە دەکەمەوە کە ئەم کـاک مـحەمەدەم لە شـوێنێک بینیـوە، بەڵام بە بیـرم نـایەتەوە. شـەو کە لە مـاڵی یەکێـک لە کوڕەکـان خەوتـم، هێشـتاش هەر بیـرم دەکـردەوە کە داخـۆ لە کـوێم بینیـوە. لەپـڕ شـتێک بە مێشـکمدا دێـت و بە بیـرم دێـتەوە کە ئەوم لە کـوێ بینیوە. لە بورجەکـان، لە قەڵاکان، لەو ئەفسـانانەی کە بە منداڵی ئەوەندەم بیستوون و لە کتێبەکاندا خوێندومنەتەوە. ئەو کاتـانەی کە کاروبارمان نەبوو، دایک ماندوو شەکەت لە کار دەگەڕایەوە، چرا نەوتییەکەی لەسەر کورسی دادەنا و مێشوولە تێی دەئاڵان.

نانی ئێوارەمان دەخوارد و دایکمان حەکایەتی بۆ دەکردین، بەڵام ئەو لە ماندوێتیان هەستی پەرت دەبوو ئێمەش لێی دەپاڕاینەوە، تکامان لێدەکرد کە حەکایەتێکمان بۆ بکات. دواجار هەرچۆنێک بووە هەروا شەکەت و خەواڵوو حەکایەتی بۆ دەکردین:

(هەبوو نەبوو.. چەندین ساڵ بەرێ لەو کێوانەی دوور دوور، ڕۆژێک، پیاوێک کە...)

***

## لە ڕێوڕەسمی بە خاکسپاردنی پێشمەرگەیەکدا بەشدار دەبم

ڕۆژی دووەمم لە شنۆ، باسی شەڕی 'سەرو' (یەکێک لە گوندە کوردنشینەکانی سەر سنووری تورکیا) کە لە شارەکانی دیکە هەر وەک مقۆمقۆ باس دەکرا، بە تەواوی بووە جێی باس. سات بە سات هەواڵی تازە دەگەیشت. دەڵێن خەڵکی گوندەکە دژی چەتەکانی حەسەنی و جەندرمەکانی ناوچەکە کە ویستوویانە پاسگا لە 'سەرو' دابنێنەوە، بووەتە شەڕیان. هەواڵی دیکەش دێن. دەڵێن شەڕەکە لە نێوان ئاغاکان و چەکدارەکانی حەسەنییە. هەرچیەک بێت ڕۆژانە تەرمی شەهیدێک بۆ شارێک دێتەوە. ئەمڕۆکەش نۆرەی شنۆیە، پێشمەرگەیەکی شنۆیی لە سەرو کوژراوە و تەرمەکەی هاتۆتەوە شار. شار کپ و خامۆشە، بێدەنگی باڵی بەسەر خەڵکەکەدا کێشاوە. هەموویان بە ڕێز و بێدەنگییەوە تەرمی شەهیدەکە بەرەو تەپۆلکەیەک کە گۆڕستانی شارەکەی لێیە دەبەن. ئەو کەسانەی لە شەڕی نەغەدەش شەهید کران لەوێدا نێژراون.

هەر شارێک و گوندێک بگری جگەرگۆشەیەکی لە شەڕەکانی نەغەدە سنە، مەریوان، سەرو و شەڕەکانی دیکە کە دواتر بە سەریاندا دەسەپەندرێت لە دەست داوە و لە دەست دەدەن. ئێستا ئەم شەهیدەش خەریکە بەخاک دەسپێرن. گردەکە پڕ بووە لە خەڵک. ڕق و نەفرەتی خەڵکی کورد بەرامبەر بە دەوڵەت و بەکرێگیراوەکانی، گردەکەی تەنیوە. لە سەر گۆڕی هەر

شەهیدێک کێلێکیان وەک ستوون چەقاندووە و وێنەی کلاشینکۆفێکی ڕووسی لەسەر هەڵکەندراوە و لە دەوروبەری کلاشینکۆفەکەشدا سروودێکی کوردیان هەڵکەندووە.

شەهیدەکە بە خاک سپێردرا. ئامادەبووان لە گردەکە هاتنە خوار.

دەوڵەت هەقیەتی لەو کلاشینکۆفانە بتۆقێت. کاتێک ئەو تفەنگانە بکەونە دەستی کوردێک پشتی ئیمپریالیزم دەلەرزێت. کەواتە تا درەنگ دانەهاتووە دەبێ دەستوبرد بکرێت، کورد کپ بکرێت، کلاشینکۆفەکانیان لە دەست دەربێنن.

***

# که بەرەو لای نەغەدە دەڕۆیت
# ئازادیت لە دەست دەدەیت

چەتەکـانی حەسـەنی کە خۆیـان بە سـەربازانی کۆمـاری ئیسلامی دەزانن، ئەو چەقۆکێشانەن کە بە کرێگرتەیی بوونەتە پارێزەرانی قورئان، بە درێژایی جادەکە، بە خۆیان و تانک و تفەنگەکانیانەوە دەبینـدرێن. کە دەگەیـتە شـاری نەغەدە، لە دەروازەی شارەوە (لە لای ڕێگای شنۆوە) کەسێک نابینیت جلی کـوردی لەبەردا بێـت، بە قەولـی کـوڕە بـانەییەکە هەموویـان شـەلواری دوولکیـان لەبەردایە. لە پشـت جامخـانەی دوکانەکاندا وێـنەی خـومەینی و شـەریعەتمەداری[1] دەبینـدرێن، هەڵـبەت لە بەرامـبەر هەر وێنەیەکـی خومەینیـدا لانـی کەم دوو وێـنەی شـەریعەتمەداریان هەڵواسیوە. شتێک کە لە هەموو کوردستاندا نمـوونەیەکی نـابینی، لێـرە دەیبینـی، پیاوەکـانی حەسـەنی، پاسەوانەکان، جەندرمەکان هەموویان بە چەکەوە لە نێو شاردا دەبیندرێن. کاتێک لە نێو شـاردا دەسووڕێمەوە، کەمەربەند لە پشت و تفەنگ لە شانەکان جێ دەهێڵم و دەچمە بەشێکی دیکەی

---

١-مـحەمەد کـازمی شـەریعەتمەداری١٩٠٥-١٩٨٦ لە دایکبـووی تەورێـز یەکێک لە ئـایەتوڵڵا گەورەکـان و مەرجەعـی تەقلیـدی شـیعەکان، دوای شۆڕشی ئێران لەگەڵ ئایەتوڵڵا خـومەینی نـاکۆکی دەکەوێتە نێوانیـان و لەوساوە لە ماڵەکەی خۆی دەستبەسەر دەکرێت تا ئەو ڕۆژەی دەمرێت. ڕێگە نادرێت ڕێورەسمی ناشتنیشی بۆ بکرێت بە شەو لە گۆڕستانێک دەینێژن.

شــــارەکە کە کــپ و خامۆشــــە. دوکانەکــــان داخــــراون و لە شەقامەکاندا چۆلەکە باڵ نابزێوێت، کە زیاتر دەچمە پێش، دەبینم لەم بەشـەی شـار ماڵەکان و دوکانەکان سـووتێندراون و وێران کـراون، چراکـان، جـاجم و بەڕەکـان، سـۆباکان، سـەماوەرەکان، دەمپاییە سووتاوەکان لە کۆڵانەکاندا فڕێ دروان. بە بیرم دێتەوە ئەوە ئەو نەغەدەیە کە شــەڕ دەســتی خــۆی لێوەشــاندووە و سـوپای کۆمـاری ئیسـلامی ماڵەکانی بەسـەر هاوڵاتیـانی کـورددا ڕمانــدووە و وێرانـــی کــردووە. لە کۆڵانێکــدا کــوڕێژگەیەک سـندوقێکی لە بەردەم خــۆی دانــاوە و دۆ دەفرۆشــێت. لە لای دادەنیشم و سـەری قسـانی لەگەڵدا دەکەمەوە. یەکەمجـار متمـانە ناکات، پاشان سەیرێکی جانتاکەم دەکات و دەڵێت:

"ڕۆژنامەنووسیت؟"

"نە، ڕێبوارم"

"تورکی؟"

"نە، تورک نیم"

ورده ورده متمانەم پێ دەکات و دەکەوێتە قسە:

"ئەم گەڕەکە گەڕەکـی کـوردانە، سـوپا بە سـەری دادایـن و ئێمەی لە شار وەدەر نا."

"تۆ خۆت کوردی؟"

"بەڵێ"

"ئەی کەواتە تـۆ چـۆن لێـرەی، مەگەر ئێـوەش لەگەڵ ئەوانـی دیکەدا نەڕۆیشتن؟"

پەرداخێک دۆم بۆ تێ دەکات.

"ئێمەش ڕامان کردبوو، لە چیا بووین، لە گوندێک نانیان بۆ دەهێنـاین، بەڵام ئـێمە پارەمـان نەبـوو دەبـوا بگەڕابـاینەوە کـار بکەین."

"چ کارێک دەکەن؟"

شتەکانی خۆیم نیشان دەدات: "من دۆ دەفرۆشم"
"کێ لێت دەکڕێت؟"
خەڵک لە چیاکان دێنەوە، ناچارن، خۆ ناکرێ هەر لە چیاکان بمێننەوە."
گوتم: "ماڵی ئێوەیان تێک داوە؟"
وەک ئەوەی مافی خۆیان بێت ماڵ و خانوویان بەسەردا برووخێنن. گوتی:
"ئاگریان تێ بەرداوە. دوو ژووریان سووتاندوون، کەلوپەلەکانمانیان دزیوە، هەرچی هەمانبووە بردوویانە."
پرسیم: "کەسیان لە ئێوە کوشتووە؟"
بە جۆرێک کە کوشتن بۆ کەسێکی کورد شتێکی ئاسایی بێت، گوتی:
"باپیرەم پیر بوو، نەیتوانی ڕابکات. لە ماڵەوە مایەوە، پیاوەکانی حەسەنی هاتبوون بە چەقۆ ورگیان دڕاندبوو."
باوەڕم بەو قسانە نەدەکرد، بیرم کردەوە ڕەنگە درۆ بکات. سەیری ڕوخساریم کرد، ئاخر بۆ دەبێ درۆ بکات.
پرسیارم کرد: "درۆ ناکەیت؟"
دیسان وەک ئەو پرسیارە ئاسایی بێت و ئەمە مافی کورد بێت ئاوا لێی بپرسن، گوتی: "نە، دوای چل ڕۆژ لە چیاکان هاتینەوە و چووینەوە ماڵ، ماڵ بۆنی گرتبوو، کەس باپیرەی نەناشتبوو. بۆگەنی کردبوو، دەوروبەری پڕ بوو لە خوێنی وشکەوەبوو. مێش و مەگەس..."
لەو قسەیەی کردبووم پەشیمان بوومەوە.

***

## سوپا لە نەغەدە تاوانی ئەنجام داوە

لەو دەرفەتە کــورتەی کە لەگەڵ مێرمنــداڵە دۆفرۆشــەکەدا قسەم دەکرد، چەند گەنجێکی کورد لە دەورم کۆبوونەوە. دیسان وەکو شارەکانی دیکە، ئەوان سەری قسانیان کردەوە و ئاشنای یەکدی بووین و بڕیار درا ئەوان وێرانە و خانووە ڕووخاوەکانی شارم نیشان بدەن و قسەم بۆ بکەن. پارەی دۆیەکەی کوڕێژگەم دا، بەلام ئەو پارەکەی دامەوە و گوتی:

"نە کاکە، پارە لە تۆ وەرناگرم."

دەستم گوشی و لەگەڵ گەنجەکان بۆ بینینی گەڕەکی کوردان چووین. ئەوان دەیانگوت:

"ئەمە بەدبەختیــیکە، ئـێمە لەگەڵ عەجەمـان دۆسـت بـووین، هەمـوو هاوڕێکانمـان بـوون، بەلام تێنەگەیشـتین ئەو شـەوە چی ڕوویدا، چ پێشـهاتێک قەوما، کە هەموومـان لە بیرمـان چوو خۆ ئـێمە هـاوڕێ و بـرادەری یەکـدین. هەمووەمـان کەوتیـنە گیـانی یەکدی. ئێمە لانی کەم بیست، بیسـت و پێنج سـاڵ لەگەڵ هـاوڕێ تورکەکانمان دۆست و هاویاری بووین، بەلام ئەوکات چەکمان هەڵگرتبوو و بەربووبووینە گیانی یەکدی. ئێمە نازانین تاوانی کێیە، بەلام ئـێمە هـیچ کـات لەگەڵ تورکەکـان ئەو کێشـانەمان نەبووە. دەستێک لە مەدا هەبوو."

کوڕەکـان بە دڵنیـاییەوە دەیـانگوت دەسـتێک لەو ئـاژاوەیەدا هەبووە. بەڵێ دروستە دەستێک لەو کارەدا هەیە، دەستی چەند کەسێک لە پیاوەکانی دەوڵەت، چەند کەسێک لەوانەی کە دەوری

ترۆپکی دەسەلاتی قومیان داوە. دەستی کەسانێک کە نۆکەری ئیمپریالیزمن. کلکەلەقێی بۆ دەکەن. ناکرێ پەنجە بخەیتە سەر ئەو کەسانە و بلێی 'ئەمەیان' بەڵێ ئەمەیان کاسەلێسی ئەمریکایە، بەلام کەس زات ناکات. نەک لەبەر ئەوەی لە جەندرمەکان بترسێت، یان لە ئاخوندەکان، نە. لە خەڵکەکە، لەو خەڵکەی کە خەریکە سواری سەر ملی خۆی دەبێ، ترسەکە لەو خەڵکەیە. دەبێ تاکەی هاوار بکەین کە ئیمپریالیزم کوردستان (کوردستانی ئێران، عێراق، تورکیا، سوریە)ی دەوێت تا بە هۆی کۆنەپەرستی، کۆنەپەرستییەک کە ئەو خۆی دروستی کردووە بەسەر خەڵکی تێکۆشەری ئێران، عێراق، سوریا، فەلەستین و ئەوانی دیدا بەکاری بهێنێ. ئێمە دەبێ چەند هاوار بکەین کە ئیمپریالیزم ئەوەڵێن و سادەترین تاوانێک کە دەیکات بە گژ یەکدا کردنی ئەو گەلانەیە کە چەندین سەدەیە بە شادی و دۆستانە پێکەوە ژیاون و هاورێی یەکدین، بەلام لە پرێکدا و لە کاتی خۆیدا ئامریکا پیاوەکانی خۆی رەوانە دەکات، راستگۆترین کەسەکان لە شەوێکدا دەکرێنە دوژمن و وەک پیاوخراپ ناوزەد دەکرێن و رۆژی دواتریش سوپا، دەبێتە سوپای خۆشەویستی کۆماری ئیسلامی، کورد دەبێتە ناپاک بەرانبەر بە دین و بەرانبەر بە کۆمار و ئەوەی دیکەش ئاشکرایە..

گەنجەکان کۆلانە چۆڵەکان و خانووە کش و ماتەکانیان نیشان دام و لەبارەی شارەکەوە قسەیان بۆ کردم:

'نزیکەی دوو لەسەر سێی ئەم شارە تورکن، ئەمانە یەکەمجار لێرە نەبوون، بەلام تورکەکان بیرکردنەوەی ئابووریان بە هێزە، زۆر ئاسان دەتوانن رێگای دەسەلات و خۆقایمکردن لە هەر ناوچەیەک بدۆزنەوە و ئابووری ئەو شوێنە بگرنە دەستی خۆیان، بە پێچەوانەی کورد کە بیر لە شتی وا ناکەنەوە. کورد گەلێکە لەگەڵ ئەو هەموو ستەمەی لێشی دەکرێ دیسان متمانە

به خەڵکی دیکە دەکات. خۆی ڕێگە دەدات میللەتانی دیکە سواری سەر ملی ببن و بە فرتوفێڵ سوود لە دڵسافییان وەربگرن و کەڵەگاییان بەسەردا بکەن."

دەیانگوت:

"لێرە بازاڕ بە دەستی تورکەکانەوەیە، نانەواخانە، گۆشتفرۆشەکان، نەوتفرۆشەکان هەموو شتێک هی ئەوانە. کورد زیاتر کرێکاری و قوڕکاری دەکات، لە کوورەخانەکاندا کار دەکات و دێت پارەکە لە بازاڕ دەخاتەوە دەستی تورکەکان. ئەمانە هیچ کێشەیەک نەبوون، هیچ کەس بیری لەو شتانە نەدەکردەوە. لە ڕووی خزمەتگوزارییەوە وەک تەندروستی، ئاو، کارەبا، پاکوخاوێنیی گەڕەکەکان و شتی لەو جۆرە هەمیشە ڕەوشی کوردەکان خراپتر بوو لە هی تورکەکان، بەڵام دیسان کەس نارەزایەتییەکی نیشان نەداوە، یان ئەوەی کە تورکەکان بە هۆی کڕینی کەلوپەلەکانیانەوە لە لایەن کورد و بە هۆی کوردەوە بوونەتە ملیۆنێر، دیسان کەس نارەزایەتی نەبووە، هەموویان بە ئاشتی و خۆشییەوە دەژیان، بەڵام لە پڕێکدا و دوای شۆڕش پرسی وەک شیعە و سوننەیان هێنایە پێش و بە هەموو هێزیانەوە پەلاماری ئێمەیان دا. ئێوە بڕۆن ببینن شووشەی پەنجەرەی تورکێک شکاوە، بزانن زیان بە تورکێک کەوتووە، نەخێر، بەڵام بۆ کورد هیچ شتێک نەماوەتەوە، ئایا ئەمە خۆی بەڵگە نییە کە شتێک لە ئارادا هەیە؟"

یەکێک لە گەنجەکان بەو قسانەی، منی خستەوە بیری مامۆستا پیرانشارییەکە، کە دەیگوت:

"نەغەدە فەڵەستینە، ئێرە داگیرکراوە، ڕێک وەکو فەڵەستین کە زایۆنییەکان هاتن یەک بە یەک زەوییەکانی فەڵەستینییەکانیان کڕی و ئابووریی فەڵەستنیان گرتە دەست و لە دەرفەتێکی گونجاویشدا بە پشتیوانی ئینگلیزەکان، بە تانکەکانیان

خانووەکانیان بەسەردا ڕماندن و هەندێکیان ڕاونان و بەشێکیان کوشتن و دەستیان بەسەر شارەکەدا گرت. لێرەش بە هەمان شێوەیە. تورکەکان چەندین ساڵە خەریکن زەوی و زاری کورد دەکڕن و خانوو دروست دەکەن و ئابووریی شارەکە دەگرنە دەستی خۆیان."

چەند ماڵێکی لە گەڕەکی کوردان نیشان دام و گوتی:

"ئەگەرچی لە نێوان گەڕەکە کوردییەکان و گەڕەکە تورکەکان جادەیەک هەیە و ئەو جادەیە خۆی سنووری نێوان هەردووکیانە و لێکیان جیا دەکاتەوە، کەچی تورکەکان هاتوون و لەم گەڕەکەی کوردانیش خانوویان دروست کردووە، جا هەر ئەمانەش کەوتبوونە گیانی دراوسێ کوردەکانیان. بەمە دەگوترێت نەهەماتی و ئێرەش پێی دەگوترێت فەڵەستین، ئێمەش ئاوارەکانی فەڵەستینین کە بۆ بەدەستهێنانی ژیان و بژێویی خۆمان دەبێ بجەنگین،"

لەگەڵ گەنجەکاندا کوچە و کۆڵان و خانووە ڕووخێندراوەکان گەڕاین. شەویش لە ماڵێ یەکێک لە کوڕەکان کۆبووینەوە. کاتی نانخواردن، ئەو دەمەی سفرەیان دانا، لەسەر سفرەکە تەنیا نان و پەنیر هەبوو. گەنجەکان بە شەرمەوە، بەڵام بە نەفسبەرزییەوە گوتیان:

"دەبێ بمانبووری، ئێمە هیچ شتێکمان نییە بۆ خواردن، ماوەیەکی زۆر ئاوارە بووبووین، ئێستا یەک دوو شەوە هاتووینەتەوە ماڵ. پارەش هەر باس مەکە. چرایەکیش نییە، نەفت نییە، شتێک نییە، جگە لەوە هەموومان بڕیارمان داوە ئیدی هیچ شتێک لە تورکەکان نەکڕین. بڕیارمان داوە کە ئابووریی تورکەکان لە نەغەدە نابووت بکەین، بۆیە نانخواردنی ئەمشەومان دەبێ هەر ئەمە بێت، نان و پەنیر بخۆین."

نانەکەم ڕاکێشایە پێش خۆم، پارچەیەک پەنیرم لێکردەوە و لە نانەکەم هەڵسووی و وەکو ئەو کوڕە کوردانەی کە بە تەمای نــابوتکردنی ئــابووریی تورکەکــان بــوون پــارووەکەم خســتە دەممەوە.

***

## دەبێت ئاگام لە خۆم بێت، خەریکم هەڵە دەکەم

خەریکە هەڵە دەکەم. گومانم نییە کە لە زۆر بابەت، لە داوەرییەکانم، لە شیکردنەوەکانم و لە یاداشتەکانم هەڵەم کردووە وەکو ئێستا، ئەمە ترسناکە، من خەریکە هەستێکی دژە تورک دەگرمە خۆ. لەسەر سفرەی ئەو هاوڕێ نەغەدەییانەم بە ڕاستی خۆم بە کوردێک دەزانی بە ڕک و کینەوە خۆم لە گەلانی دیکە جیا دەکردەوە. دەبێ زۆر ئاگادار بم هەڵە نەکەم. ئەرکی ئێمە ئەوەیە کە گەلانی ستەملێکراو یەکخەین، لاوانی ستەمدیدەی کورد و تورکی نەغەدەیی دەبێ دەستی یەکدی بگوشن، دەبێ دۆستایەتی بەهێز بکەین. دوژمنێکی هاوبەشیان هەیە. ئەو دوژمنە سەرمایەدارییە، سەرمایەداریی گەورەیە، خاوەنداریی تایبەتە، ئیمپریالیزمە و نوێنەرەکەی لێرە و لە هەموو جێیەک ئەمریکایە. ئەو سەرمایەدارە تورکە بە یەک ئەندازە کورد و تورک و بەلوچی ستەمدیدە دەچەوسێنێتەوە، بە هەمان شێوەی کە ئەو سەرمایەدارە کوردە. گەنجە نەغەدەییەکان دەڵێن کە کورد میللەتێکی ستەملێکراوە، دەڵێن کورد هەموویان قوڕکاری و کرێکاری دەکەن. لە کوورەخانەی تورک و فارسەکاندا کار دەکەن. دەڵێن فێڵ لەکوردان دەکەن، دەیانچەوسێننەوە.

بەڵێ ئەمە هەموو ڕاستە، بەڵام دەبێ بزانین بۆچی کورد هەموو کرێکاری و زەحمەتکێشییە دەکات، بۆچی هەموو ژێر چەپۆک و چەوساوەیە؟

***

## گەنجەکان دەرمانی دەردەکەم نیشان دەدەن

گەنــج، گەنجــی هۆشــیار، ئەو گەنجــانەی دەردەکــان دەســت نیشـان دەکەن، لە هەمـوو جێگایەک تۆ کە بیانبینیت و هـاتوویتە ناویـــان ئەوان بە یەکێـــک لە خۆیانـــت دەزانـــن و دێـــنە لات و ڕەگوڕیشـــەی دەردەکەت پـــێ نیشـــان دەدەن. بیـــانی کاتێـــک کە مـاوەیەک لە نـاوچەکە دەمێنـنەوە دەبینـی ئەو گەنجـانە، چەکێکی زۆر کاریگەریـان بە دەسـت هێنـاوە تـا بە هـۆیەوە بچـنە شـەڕی دەرد و نەهامەتییەکـان، شـەڕی نایەکسـانیەکان. چەکێکی بە هێز کە ئێســـتا خەریکــن فێــردەبن چــۆن ئەو چەکە بگــرنە دەســـت، بیکەنەوە، بیبەستنەوە، نیشانەی پێ بگرن، پەلاپیتکەکەی دابگرن و لەگەڵ ئەوەشدا ڕیزەکان یەکخەن، خۆیـان یەکـخەن و فەرمـان وەربگرن، فەرمان بدەن و بجووڵێن. ئەو چەکە بە هێزە 'زانست و هونەری ڕزگارکردنی زەحمەتکێشـان'ە. و گەلانـی دیکەش هەر کە کـاتی خـۆی هـات، بـۆ پیـادەکردنی سۆسـیالیزم ڕوودەکەنە کوردستان، مەشق دەبینن و خۆیان رادەهێنن.



## چەتەکانی حەسەنی بە دوای چەکدا دەگەڕێن و ڕێبوارەکان دەپشکنن

کە بەرەو مهاباد دەچووین گەیشتینە سێ ڕیانێک کە ڕێگایەکی بۆ ورمێ و یەکێک بۆ نەغەدە و ئەوەی دیکەشی بۆ مهاباد دەڕۆیشت. چەتەکانی حەسەنی ڕێبوارانی کورد و گەڕیدەکان دەپشکنن و بە دوای چەکدا دەگەڕێن. کاتێک هاتنە نێو پاسەکە تا ڕێبوارەکان بپشکنن، ڕوخساری کوردەکان هێندە پەرێشان دیاربوو، کە بە زەحمەت دەکرا بەرگە بگرم و هاوار نەکەم، بەڵام منیش وەکو کوردەکانی دیکەی نێو پاسەکە سەری خۆم دانەواند و وبە داماوییەوە خۆم ڕادەستی ئەو چەقۆکێشانەی حەسەنی، ئەو پارێزەرانەی قورئان کرد کە جانتاکەم بگەڕێن و بمپشکنن، شتێک کە لە سەرتاسەری هەموو کوردستان تەنانەت ناتوانی بیریشی لێ بکەیتەوە کە کەسێک لێت نزیک ببێتەوە و پێت بڵێت ناوت چییە، نەک ئەوەی بتپشکنن. نێوچاوانم ئارەقەی کردبوو، وەکو هەموو هاوسەفەرە کوردەکانی دیکەم. پاسەکە کەوتەوە ڕێ. ڕق و نەفرەت سیمای هەمووانی داگرتبوو، بەرەو مهاباد بەڕێوە بووین، لە شوێنێکی نزیک دەروازەی شار پێشمەرگەکانی کورد ڕێگاکەیان دەپاراست، هەر لەگەڵ ئەوەی کوردە هاو سەفەرەکانم ئەوانیان بینی، گەشانەوە و بزە و شادی کەوتە سەر ڕوخساریان، نیگاکانیان گەشایەوە، دەستیان بۆ پێشمەرگەکان ڕادەوەشاند و نزایان کرد و سەریان بەرەو ئاسمان بەرز کردبووەوە، کەست

نەدەبینی نیگەران و داما بێ، کەسێک شەرمی لە ڕەوشی خۆی نەدەکردەوە، ئارەقەی نەدەکرد، ددانی دەجیڕەوە نەدەبرد. ئەوان متمانەیان بە پێشمەرگەکان هەبوو، ڕۆڵەکانی خۆیان بوون، ئازاری گەلەکەی خۆیان دەزانی، کورد بوون. بەکرێگیراوی کەس نەبوون، لە نێو زەوی و کێڵگەکاندا کاریان کردبوو، ئازاریان چەشتبوو، کاتێک نەخۆش کەوتبوون بەرگەیان گرتبوو. جا گاڵتەجاڕییەکە لێرە دایە کە سەرانی دەوڵەت ناتوانن پرسێکی ئاوا سادە دەرک بکەن. لە تارانەوە پاسدار دەنێرن، حەسەنی ڕاست دەکەنەوە، لە ڕادیۆ دەنەڕێنن. ماڵوێران ئەو میللەتەیە کە گیرۆدەی ئەو جۆرە کەسانەیە کە لە ئازارەکانیان ناگات.

***

## هەمویان پێمدەڵێن بڕۆ و مەهاباد ببینە

که بچیته کوردستان و کەسانی جیا جیا ببینی، هەموویان باسی مهاباد دەکەن، دەڵێن دیموکراسی لەوێدا لانەی کردووە. ئازادی (بە بێ قەید و شەرت) لەوێدا هەیە، بێ ئۆقرانە چاوەڕێی بینینی مهاباد بووم.

بە ڕێکەوت ئەو شوێنەی کە لە پاس دابەزیم، ڕێک بەرانبەرم لەسەر بانی خانوێکی قوڕ کە دوو نهۆم بوو، چەند لەقلەکێک لە نزیک شەقامەکە هێلانەیان دروست کردبوو. دوو دانەیان لە سەر لێواری بانەکە لەسەر قاچێک وەستابوون و سەیری شوێنێکی دووریان دەکرد، بە بینینی ئەو لەقلەکانە بە بیرم هاتەوە کە هەمووان دەیانگوت، مهاباد بۆتە شارێک کە تازە دەکرێت تێیدا بژیت.

دەر و دیواری شار پڕە لە بڵاوکراوە. زۆربەی بڵاوکراوەکان هی ڕێکخراوی چریکە فیداییەکانی گەلی ئێران-لقی کوردستانە. ئەو ڕێکخراوە توانیویە بە شێوەیەکی سەیر لە سەرتاسەری کوردستاندا جێی خۆی بکاتەوە و لایەنگرانێکی زۆر بۆ خۆی پەیدا بکات، لە هەموو جێگایەک بە ڕێزەوە سەیری فیداییەکان دەکەن.

ئەو ڕێکخراوە ئەگەر بەو شێوەیە بتوانێت، ئاوا بەو خێراییە لەنێو گەلانی دیکە جێی خۆی بکاتەوە دەبێتە ڕێکخراوێکی بە هێز و دەسەڵاتداری ئەم وڵاتە و لەو ڕووەوە کە لایەنگرانی بە دڵسۆزی و ڕاستگۆییەوە کار دەکەن دەتوانن کەم ئەزموونی و

کێماسییه سیاسییەکانی خۆیان بەلاوە بنێن و خێراتر ببنە ڕێکخراوی هەموو کۆمەڵانی بەربڵاوی خەڵک. لەم شارەدا دەتوانی بڵاوکراوەکانی ئەم ڕێکخراوە لە هەموو جێگایەک ببینی، لە مزگەوت، لە بازاڕ، لەلای وردەواڵەفرۆشەکان، لە ماڵی مەلاکان و لە نووسینگە و بنکەی ڕێبەری سیاسی-ئایینی ناوچەکە و لەهەموو جێگایەکی دیکە.

لە کوڕێکم پرسی کە خەریکبوو بڵاوکراوەی ڕێکخراوێکی سیاسی بە دیواردا هەڵدەواسی:

"ئەم بڵاوکراوانە نادڕێنن ئەزیەتتان نادەن؟"

چواردە پازدە ساڵە بوو، گوتی: "نە، هەر کەسە و خەریکە بڵاوکراوەی خۆی هەڵدەواسێت."

کاتێک خەریکبوو بڕوات، وەک ئەوەی شتێکی بیرهاتبێتەوە و بە شێوەیەک پێم بڵێ، مەبەستت تێگەیشتووم گوتی:

"نە لێرە، جێگایەک بۆ بڵاوکراوەی تازە موسڵمانەکان نییە. ئەو بڵاوکراوانە شەوان بە شێوەیەکی نهێنی لە دیوارەکان دەدەن، کەسیش نایانخوێنێتەوە، بڵاوکراوەی جاشەکانن"

دوایی لە واتای وشەی جاش گەیشتم وشەکە دەکاتە شتێکی وەک 'کوردی خۆفرۆش، بەکرێگیراو، جاسووس'.

حیزبی دیموکراتی کوردستان بارەگای کۆمیتەی ناوەندیی خۆی لە شەقامێک کە دەگاتەوە سەربازگەی مهاباد داناوە. کاتێک سەرم لە بارەگاکەدا، بێدەنگی باڵی بەسەر هەموو جێگایەکیدا گرتبوو. بە پێچەوانەی ڕێکخراوەکانی دیکە هیچ لڤ و جووڵەیەکی تێدا بەدی نەدەکرا. چەند پێشمەرگەیەک لە دەوری بارەگاکە پاسەوانیان دەکرد.

ئەو سەربازگەیە کە نزیک بارەگای حیزبە، هەمان سەربازگەی مهابادە، کە لە سەروبەندی ڕاپەڕینی خەڵکدا لە لایەن پێشمەرگەکانی حیزبی دیموکرات دەستی بەسەرداگیرا و هەموو چەک و چۆڵی نێو سەربازگەکە گوێزرایەوە بۆ بنکە و پەناگاکانی نێو چیاکان و بەمشێوەیە حیزبی دیموکرات ئێستا نوێترین چەکەکانی سوپای بە دەستەوەیە و ئەوەش خەریکە ئیمپریالیزم و پیاوەکانی لەنێو دەوڵەتدا شێت و دەهری دەکات، لەبەر ئەوەشە کە نووکی تیژی دوژمنایەتی و پەلاماردانەکانی دەوڵەت بۆ سەر کوردستان بەرەو ڕووی حیزبی دیموکراتە. بە هەرحاڵ سەربازگەکە چۆڵ کراوە و ئێستا کورد پێشنیازیان کردووە بگۆڕدرێت و بکرێت بە زانکۆ، ئەگەرچی دەوڵەت ئاوا سووک و ئاسان دەستهەڵگر نابێت. خانووە حکومییەکانی دەوروبەری سەربازگەکەش کە دوای دەستبەسەرداگرتنی سەربازگەکە چۆڵ کراون و کەوتوونەتە دەستی کوردە بێ خانووەکان. کوردانی بێ خانوو، پۆلیسخانە و سەربازگەکانیشیان دەستبەسەردا گرتووە و ئێستا لەوێدا نیشتەجێن. نایلۆنیان بە دەرگا و پەنجەرە سووتاو و شکاوەکاندا داداوە و دووکەڵ و تەنیی دیوارەکانیان خاوێن کردۆتەوە و ڕایەخیان لە عەرزەکە ڕایەخستووە و لە شوێنی ئەو بێدەنگییە سەربازییەی جاران، ئێستا سەر و سەدای دایکان و منداڵەکان هەموو ئەو باڵەخانە و خانووانەی پڕکردووە.

شاری مهاباد لە یەکەم نیگادا ئەو حاڵەتە کوردانەیەی کە لە شارەکانی دیکەی وەک شنۆ و سەردەشت و پیرانشار دەبیندرێت لەوێدا نابیندرێت، لە شارەکانی مهاباد و سنەدا فەرهەنگ و نەریتی دەرەبەگایەتی کە لە شارە بچووکە

کوردییەکانی دیکەدا هەیە لەنێو چووە. لاوەکان خەریکە لە جلوبەرگە خۆماڵییەکە بەرەو جلوبەرگی مۆدەی ئەمڕۆ دەچن و قەد و قیافەی کەسانی شارە پیشەسازییەکان بە خۆوە دەگرن. لەبەر ئەوەشە ناتوانم بە ئاسانی هاودەمێک بدۆزمەوە کە بتوانم قسەی لەگەڵدا بکەم، بە ناچاری گەشتێک بەنێو شاردا دەکەم و دواتر دەچمە هۆتێلێک. دڵم تەنگ دادێت بەڵام بێ ئاگام لەوەی کە بە زوویی دڵبەستەی مهاباد دەبم.

***

## دەچمە لای شێخ، بەڵام بێ وتوویژ و
## بە دەستی بەتاڵ دەگەڕێمەوە

لە سەرتاسەری کوردستاندا وێنەی شێخ عیزەدینم بە دیوارەکانەوە بینیبوو. لە ڕێگای ڕۆژنامەکانەوە لەگەڵ بیر و بۆچوون و تێڕوانینەکانی ئاشنا بووبووم. ئەو باوەڕی بەوە هەبوو کە گەلی کورد دەبێ ئۆتۆنۆمی خۆی بەدەست بێنێت. جیاوازییە ئاینییەکان دەبێ بەلاوە بندرێن، بەشێوەیەکی یەکسان بایەخ بە گەلانی ئێران بدرێت، وڵات بە شێوەیەکی سۆسیالیستی بەڕێوە ببردرێت. گوتبووی جوبرائیل لە ئاسمانەوە بێتە خوار ئەگەر ئۆتۆنۆمی بە دەستەوە نەبێت ڕازی نابین، گوتبووی بە یەک دەست ئیسلام، بە دەستێکی دیکە ئابووریی سۆسیالیستی، ئیمپریالیزم تێکدەشکێنین گوتبووی...

ئەو کەسێک بوو کە لە ڕیفراندۆمدا بەشداری نەکرد، نەچووە دیداری ڕێبەری قوم تا بانگهێشتیان نەکرد و دواتر کە چوو پێداگری کرد کە هەموویان بزانن ئەو لە خۆیەوە نەچووە، بەڵکو بە شێوەیەکی فەرمی بانگهێشتیان کردووە. لە زانکۆی پیشەسازیی تاراندا وتاریدا. چەپەکان ڕێزی دەگرن، مەزهەبییەکانی قوم و تاران و ئیسفەهان و... ڕقیان لێیەتی، ڕۆژنامە پێشکەوتنخوازەکان لای ئەو دەگرن (با بڵێین لای کوردەکان دەگرن).

ویڕای ئەمانە هەمووی، گشت هاوڕێیان لە سەرتاسەری کوردستان داوایان لێ کردبووم بچمە سەردانی.

ماڵی شێخ لە کۆلانێک بوو وەکو هەموو کۆلانە وێرانەکانی دیکە و ماڵێک بوو وەک هەموو ماڵە کوردێکی دیکە. چەکدارێک لەبەر دەرگا دانیشتبوو. سلاوم کرد، بە ڕێزەوە وەلامی دامەوە، گوتم:

"ناکرێت شێخ ببینم؟"

گوتی: "کەمێک بوەستە."، وەستام. دەرگای ماڵی شێخ بە ڕووی هەمووانـدا کـراوەیە. ئەو لە پەیوەنـدییێکی بەردەوام دایە لەگەڵ خەڵـک، چەنـد کەسـێک لە ژوورەکە دانیشـتبوون. ڕوخساری شێخم بە هۆی ڕۆژنامەکانەوە لە بەرچاو بوو.

خەریکبوو بە تەلەفۆن قسەی دەکرد، مێزەری لەسەر نەبوو، عەباکەی بەسەر شانەوە بوو، تەسبیحێک بەردەوام لەنێو پەنجەکانی دەخولایەوە. لەگەڵ پارێزگاری ورمێ قسەی دەکرد، بابەتی قسەکانی لە بارەی شەڕەکەی 'سەرو' بوو، ئەو پێداگری دەکرد کە تێکهەڵچوونەکە بە گفتوگۆ چارەسەر بکرێت. سوپا نەچێتە ئەوێ. جەختی دەکردەوە کە ئێمە خوازیاری شەڕ نین. شەڕمان ناوێت. پیاوەکانی حەسەنی لە دەوروبەری سەرو دوور بخەنەوە. پاسگاکە با لە لایەن کورد و تورکەکان پێکەوە بەڕێوە ببردرێت.

هەموویان بەڕێزەوە دانیشتبوون. زۆر بە ئارامی. شێخ، وتاربێژی مهاباد بوو. چەندین ساڵ لە دێ ژیابوو، جگە لە کتێبە دینییەکان، کتێبەکانی دیکەشی خوێندبوونەوە.

یەکێک لە ڕۆژنامەکانی ئەو کات بڵاوکراوەیەکی چەند فەقێیەکی قومی چاپ کرد بوو کە لەو بڵاوکراوەیە دابەزیبوونە سەر شێخ.. (چ پێویست دەکات کە ئەم مەلا کوردە نووسراوەکانی لینین کاوێژ بکات و وتەکانی مارکس بڕشێتەوە...). پیاوێکی لاواز و بالا بەرز بوو، ڕیشێکی درێژ و ماشوبرنجی هەبوو. بە ڕواڵەت پەنجاوپێنج-شەش ساڵە بوو،

بەڵام تەســـبیحەکەی خێـــرا و زووزوو لەنێـــو پەنجەکانیـــدا دەسووڕاند، دەکرایەوە، دووری ڕادەگرت، بۆ سەرەوەی هەڵدەدا و دووبـارە دەیخسـتەوە نێـو لەپـی دەسـتی، بە دڵنیـاییەوە ئەمە ئەوکـــاتە بـــوو کە لەگەڵ پارێزگـــار نەدەگەیشـــتنەیەک و بە داواکارییەکانی ڕازی نەدەبوو و شێخ تووڕەیی دایدەگرت.

شێخ چوست و چالاکە. نیشانی دەدا کە بە ئاسانی دەتوانێت ئەقسامی کلاشینکۆف ڕابکێشێت و لەسەربانیماڵەکەیدا سەنگەر لێ بدات. قسەکانی بە تەلەفۆن تەواو بوون، سەیرێکی لای منی کـرد. کە سـمێڵە درێژەکـانی منـی بینـی، پێکەنـی، دەسـتێکی بە سمێڵەکانی داهێنا و گوتی: "بەخێر بێیت."

ویسـتم قسـەی لەگەڵدا بکەم، شـتێک بڵێم، پرسـیارێک بکەم. بیرم کردەوە چ پێویست دەکات، مەگەر ناشێ لە جێیەکیش هیچ قسە نەکەم، چیم هەیە بیڵێم. بۆچوونی شێخ ڕوون و ئاشکرایە. چەندین جار لە ڕۆژنامەکاندا گفتوگۆی لەگەڵدا کراوە، کێشـەکانی کـوردم لە زمـانی خەڵـکەکە خـۆی بیسـتووە، ئیـدی چ پێویسـت دەکات بمەوێت قسەیەکی زیاتر بکەم، بۆیە بێدەنگ بووم، بەڵام نا، وا نییە. خەریکم درۆ دەکەم. من زاتم نەدەکرد لەگەڵ شێخدا قسـە بکەم. ئەم کـارە بۆ مـن سەخت بوو، خـۆم کەمێک بچـوک هەست پێ دەکرد. چەنـد جارێک ویسـتم قسـەیەک بکەم، بەڵام بیـرم کـردەوە خـۆ شـێخ ئەو وەرزێـرەی سەرسـنوور نیـیە، کە سووک و ئاسـان بچـمە نێو کێڵگەکەی و سـەری قسـانی لەگەڵدا بکەمەوە. لەوێ هەروا بەبێ مەبەست قسەیەک بکەم، بەبێ ئامانج پرسیارێک بکەم، یان زۆر ئاسان داسەکەی لێوەربگرم و هەر بۆ پێکەنـین مەڵـۆیەک گەنـم بـدوورم. یـان بـێ پەروا بچـمە سـەر تـوورەگەی نـانەکەی و بە ڕووقـایمی نیوەی تێشـووی نیوەڕۆی بخۆم. دەمزانـی پرسـی شـێخ شـتێکی دیکەیە، لەبەر ئەوەبوو کە بێدەنگ بووم.

تەلەفۆن زەنگی لێدایەوە، لە تەلگرافخانەوە بوو. شێخ نێوەڕۆکی تەلگرافەکەی لە پشت تەلەفۆنەوە بۆ بەرپرسی تەلگرافخانەکە خوێندەوە:

(لە سەید عیزەدین حوسێنییەوە بۆ جەنابی بازرگان سەرۆکوەزیری شۆڕشی ئێران..)

ناوەرۆکی تەلگرافەکە شەڕی سەرو، چۆلکردنی شاری مەریوان لە خەڵکەکەی و پەنابردنیان بۆ کێوەکان، ڕووداوەکانی سەردەشت، نیگەرانیی گەلی کورد و تاوانەکانی حەسەنی بوو. هەروەها لە تەلگرافەکە دیسان جەختی کردەوە کە کورد جوداخواز و شەڕخواز نییە، کورد شەڕی ناوێت.

شێخ سەیرێکی منی کرد و سەری خۆی هەژاند، واتە ئاگاداری تۆم، بەڵام چی بکەم سەرم قاڵە. سەری خۆم هەژاند و واتە بەڵێ دەبینم، تکا دەکەم ئێوە کارەکانی خۆتان بکەن. یەکێک لە کەسەکانی ماڵەوە ڕادیۆیەکی بچوکی بۆ شێخ هێنا و بە زمانی کوردی شتێکی گوت. تێگەیشتم کە دەنگی خودی شێخە کەوا لە ڕادیۆی مهابادەوە پەخش دەکرێت. شێخ بۆ خەڵکی کوردستان پەیامی دابوو. ڕادیۆکەی لە نزیک خۆی ڕاگرت و بە وردی گوێی لێگرت. زۆر کەم حاڵی دەبووم کە چی دەڵێت. هۆشداری دابووە خەڵک کە ئاگادار بن شەڕمان بەسەردا نەسەپێنن و داوای لە کورد و تورک کرد بوو کە وەک چۆن بوون ئاوا وەک برا بمێننەوە.

کە پەیامەکە تەواو بوو، شێخ سەیرێکی ئەوانەی ژوورەکەی کرد. کاتێک بینی کەوا هەموویان بە نیگاکانیان لەگەڵ قسەکانیدا هاوڕابوون، خۆشحاڵ بوو و پێکەنی. بە بیرم هاتەوە کە چاوپێکەوتن و گفتوگۆکانیم لە ڕۆژنامەکاندا چەند بە تامەزرۆییەوە دەخوێندنەوە و ڕۆژنامەکان چەند بە بایەخەوە وێنەکانیان چاپ و بڵاو دەکردەوە. شێخ دیسان سەیرێکی لای

منی کرد. چاوەڕێی ئەوەی دەکرد کە ئەو بیانییە بە ڕواڵەت و قەد و قەوارەیەوە وا دەردەکەوێت سەری لە زۆر شتان دەربچێت، قسەیەک بکات، پرسیارێکی هەبێت، بەڵام بیانی هێشتا هێدمەی گرتبوو و هێشتا گیرۆدەی خۆی بوو و لەگەڵ خۆیدا دەستوپەنجەی نەرم دەکرد. شێخ سەیری کرد، بیانییەکە نایەوێت قسەیەک بکات، بۆیە ئەو ڕۆژنامانەی کە تازە بۆیان هێنابوون، رایکێشانە پێش خۆی و چاوێکی پێداخشاندن. گەیشتە بابەتی بڵاوکراوەکەی فەقێکانی قوم، خوێندییەوە، دواتر وەک ئەوەی بزانێت منیش خوێندوومەتەوە، سەیرێکی لای منی کرد و بە شێوەیەک پێکەنی کەوا هەستم کرد بڵێت:

(ئەمە یانی چی! ئەم قسانە چ واتایەکیان هەیە؟!)

بە نیگام وەڵامیم دایەوە و هاودەردیی خۆم نیشان دا و هەوڵم دا تێی بگەیەنم کە:

(گوێ مەدەرێ، لێگەڕێ هەرچی دەیانەوێت با بیڵێن.)

کە بینی هاودەردی لەگەڵدا دەکەم سەری لە سەر ڕۆژنامەکە هەڵگرت و دیسان تەسبیحەکە کەوتەوە خولانەوە.

کورەکەی شێخ کارەکانی ڕۆژانەی بۆ رایی دەکرد. چایچییەکە بۆ ئەوانەی دەهاتنە لای شێخ پەیتاپەیتا چای دەهێنا. کوڕێژگەیەک هاتە ژوورەوە، دە دوازدە ساڵە دەبوو، بڵاوکراوەیەکی لە بەردەمی شێخ دانا. شێخ یەکسەر ڕۆژنامەکەی خستە ئەو لاوە و بڵاوکراوەکەی هەڵگرت. تەسبیحەکەی نێو دەستی لە خولانەوە کەوت. لە ماوەی دە خولەکدا ناوەرۆکی بڵاوکراوەکە تێگەیشتبوو. پێم خۆش بوو منیش ئەو بڵاوکراوانە بخوێنمەوە. سەیرێکی شێخم کرد یەکسەر لە مەبەستەکەم گەیشت. بڵاوەکانی دانانە پێشم. وەکو ئەو، بە خێرایی چاوم پێدا گێڕان. دوو بڵاوکراوە هی ڕێکخراوی 'چریکە فیداییەکانی گەلی ئێران- لقی کوردستان' بوون. دوو بڵاوکراوە

هی ڕێکخراوی شۆڕشگێڕی زەحمەتکێشانی کوردستان و چەند بڵاوکراوەش هی حیزبی دیموکرات بوون.

چریکەکان نووسیبوویان (دەبێ حیزبی دیموکرات هەڵوێستی خۆی لە بارەی قیادە موەقەتەییەکان ڕوون بکاتەوە..)

کاتێک بڵاوکراوەی چریکەکانم دەخوێندەوە، شێخ سەری بۆ دەهەژاندم، وەک ئەوەی خۆی بڵاوکراوەکە بخوێنێتەوە و هاوڕا بێت لەگەڵیدا.

حیزبی دیموکرات ڕێپێوانەکەی سنەی بۆ مەریوان بە هەنگاوێکی چەپڕەوانە ناو نابوو و ڕەتی کردبووەوە. پێدەچێ شێخ بەو هەڵوێستەی حیزبی دیموکرات دەهری بووبێت، چونکە ئەو بۆ ڕێپێوانەکە پەیامێکی ناردبوو و پشتیوانی و سڵاوی بۆ ناردبوون.

کوڕەکەی شێخ بڵاوکراوەکانی لە سەر تاقەکە لە چەکمەجەی جیاجیا دانان.

هەندێ شەو، ئەوانەی ماڵەوە دەبینن کەوا شێخ لە ژوورەکەی نەماوە، بە هەشتاوییەوە دەچنە دەرەوە و بە دوایدا دەگەڕێن، بەڵام شێخ زۆر دوور نەکەوتۆتەوە، حەزی لێبووە پیاسەیەک بکات، ویستوویە کەمێک بە تەنیا لە هەوای کراوەدا بە پێیان بڕوات، بیر بکاتەوە، بڵاوکراوەی سەر دیواران بخوێنێتەوە. ئەو کارەش دەکات. بەردەوام چاویلکەکەی بەرزونزم دەکاتەوە، سەری بۆ دواوە دکێشتیەوە، دێنێتە پێش تاکو لە ژێر ڕووناکی گلۆپی دارتێلێکی سەر جادەکە بڵاوکراوەیەک کە ڕەنگ بێت نەیبینیبێت، بخوێنێتەوە. شێخ سەیر چۆتە نێو خوێندنەوەی ئەو بڵاوکراوەیە، یان دەستی لە پشتەوە گرتوون و سەری هێناوەتە پێش و خەریکە ئاوا بە درێژایی شەقامێکدا دەڕوات کە کەسەکانی بە هەناسەبڕکێ و ماندوو خۆی پێ دەگەیەنن و بە زۆر دەیگەڕێننەوە ماڵەوە.

شێخ خەریکە قسە لەگەڵ ئەوانە دەکات کە هاتوونەتە لای و بە ووردیش گوێیان لێ دەگرێت. لە شارەکانی دیکە لاوەکان بۆیان باس کردم:

(نابێ چەند خولەک زیاتر لە لای شێخ دابنیشین، کاتێک بۆ کارێک دەچین، کە قسەکانمان کرد، دوای ئەوەی گوێ لە قسەکانمان دەگرێت، دەڵێت 'زۆر باشە هەستن برۆن، هەستن بە دوای کاروبار و ئەرکەکانتاندا برۆن، چیدی لێرە دامەنیشن، برۆن بۆ گوندەکان، درەنگ دادێت هەستن برۆن')

گەنجەکان دەیانگوت هەر خۆمان بگنخێنین و درەنگ هەستین، شێخ وەکو ئەوەی بەسەر کورەکەی خۆیدا هاوار بکات، توورە دەبێت و دەڵێت 'ئێوە هێشتا هەر لێرە دانیشتوون، هەستن برۆن، برۆن بۆ گوندەکان، لێرە دانیشتن چ دەردێک دەرمان دەکات، هەر بە ڕاستی بۆچی ئاوا بە کۆمەڵ ڕەگەڵ یەک دەکەون و دێنە ئێرە، مەگەر لێرە چ هەیە، مەگەر ئێوە کارتان نییە، ئەگەر گرفتێک هەیە، ئەگەر کێشەیەک هاتۆتە پێش، مرۆڤ کەسێک دەنێرێت، نەک وەک ئێوە دەستەیەک بێنە ئێرە، زوو بن برۆنە دوای ئەرکەکانتان، درەنگ دادێت.

کوڕەکان دەیانگوت:

"ئێمە زات ناکەین بچینە ماڵی شێخ، تەنیا کاتێک دەچینە دیداری کە بە ڕاستی چارەیەکمان نەبێت وکێشەیەکی وا هەبێت بە ئێمە چارەسەر نەکرێت."

شێخ لە نێو دڵی هەموو کوردێک دایە. کاتێک هەڤاڵەکانی حیزبی دیموکرات دەیانەوێت بچن دێنشینەکان بۆ ڕێپێوانێک یان وتار و گردبوونەوەیەک بهێننە شار، دێهاتییەکانی ئەندامی حیزبی دیموکرات ئەگەرچی بێچەندوچوون ملکەچی فەرمانەکانی حیزبەکەیانن، بەلام یەکەمجار دەپرسن: (شێخ گوتوویە بێینە شار و ڕێپێوان بکەین؟ شێخ گوتوویە بێینە شار گوێ بدینە

وتارەکە؟).
دێهاتییەکان پێیان وایە هەموو کەسێک دەبێ ئەندامی حیزبی دیموکرات بێت، بەو پێیە شێخیش بە ئەندامی حیزب دەزانن. هەڤاڵانی حیزبیش سوود نا، خراب سوود لەمە وەردەگرن.
شێخ فاکتەری یەکێتی و یەکڕیزی هەموو هێزەکانە لە کوردستان، ئەو چەندین جار بە بەهای زۆر گران توانیویە ئەو یەکڕیزی و یەکێتییە کە خەریکبووە لەنێو بچێت، بپارێزێت و لە شوێنی خۆی هێشتوویەتیەوە.
ئەو ڕۆژەی کە پەیکەری شای هەڵاتوو لە مەیدانی شاری مهاباددا دەڕووخێنن، خەڵک دەڕژێتە شەقامەکان و بە هاوار و دروشم وتنەوە خۆیان دەگەیەننە مەیدانی شار و دەیانەوێت لە شوێنی پەیکەرەکەی شا شتێک دابنێن، مەزهەبییەکان پێداگری دەکەن کە ئاڵای سەوزی ئیسلام لە شوێنەکە بچەقێنن، گەنجانی خوێنگەرمی کۆمۆنیست پێداگری دەکەن کە ئاڵای سووری کۆمۆنیزم بەرز بکەنەوە. لەو نێوەدا گەنجێک خۆی هەڵدەداتە نێوانەوە و دەڵێت، ئێمە دەبێ یەکێتیمان هەبێ و پاشان بە دەستێک ئاڵای ئیسلام و بەدەستەکەی دیکەی ئاڵای سووری کۆمەنیستەکان دەگرێت و لە پەیژەکەوە سەردەکەوێت و هەردوو ئاڵاکە لە تەک یەکدا لەسەر شوێنەکە جێگیر دەکات، گروپە چەپەکان ڕازی دەبن، بەڵام ژمارەیەک لە لایەنگرانی ئاڵا سەوزەکە دەست بە دروشم لێدان دەکەن و بە دروشمی مردن بۆ کۆمۆنیست لە پاردەکە وەسەر دەکەون و ئاڵای سووری کۆمەنیستەکان لەو سەرەوە دەهێننە خوار. بگرە و بەردە دەست پێدەکات، یەکێک بە ڕاکردنەوە خۆی دەگەیەنێتە مزگەوت، شێخ خەریکی وتارخوێندنە. کابرا هاوار دەکات: یا شێخ خەڵک بەربوونەتە گیانی یەک، خەریکن یەکدی دەکوژن.
شێخ بە پاپەتی لە مزگەوتەوە بە ڕاکردن خۆی دەگەیەنێتە

مەیدانی شار. ڕەوشەکە مەترسیدارە، هەموویان بەربونەتە گیانی یەکدی. شێخ خۆی دەهاوێتە نێوانەوە. مهابادییە تووڕەکان لە یەک جیا دەکاتەوە و هاواردەکات:

'ئەمە چ دۆخێکە دروستتان کردووە، ئەمە چ خاکێکە خەریکە بەسەری ئێمەیدا دەکەن.'

سەر و ڕوخساری شێخ خوێناوی بووە، هێشتا هەر هاوار دەکات:

'خەریکن چی دەکەن، ماڵتان وێران کردین ئێوە..'

مەزهەبییەکان دەستهەڵگر نین. ئاڵای سووری کۆمەنیستەکان فڕێ دەدەنە سەر عەرز و بە پێ دەچنە سەری. گەنجانی کۆمەنیست هاواریان لێهەڵدەستێ، شێخ پەلاماری مەزهەبییەکان دەدات، دەکەوێتە ژێر پێیان. ئاڵا قوڕاوییەکەی کۆمەنیستەکان لە ژێر قاچی مەزهەبییەکان هەڵدەگرێتەوە و بە سەر مەزهەبییەکاندا هاوار دەکات، مەزهەبییەکان نایەنە ڕایێ. کۆمەنیستەکان هێشتا هەر هاوار دەکەن، شێخ ئاڵا سوورە قوڕاوییەکە بە سنگی خۆیەوە دەنووسێنێت و بەرەو لای گەنجە کۆمەنیستاکان دەچێت. بە خێرایی و نیگەرانییەوە قوڕەکە لە ئاڵاکە دەکاتەوە، ئاڵاکە ماچ دەکات، دەیخاتە سەر چاوی، دەیخاتە سەر سەری و دیسان ماچی دەکاتەوە و بەمشێوەیە دڵی گەنجانی کۆمەنیست دەداتەوە و ساردیان دەکاتەوە.

شێخ کولەگری قورگی گرتووە. فرمێسک لە چاوەکانیدا قەتیس ماون. هێشتا هەر خەریکی پاککردنەوەی ئاڵا قوڕاوییەکەیە و بە سنگی خۆیەوە نووساندوویە. مەزهەبییەکان لە حەپەساویان جوولەیان لەبەر نایەت. کۆمەنیستەکان چاویان پڕ بووە لە فرمێسک، شێخ کە جلەکانی هەموو خوێناوی بووە، لە پاردەکە سەردەکەوێت و ئاڵای سووری کۆمەنیستەکان لە تەک ئاڵای سەوزی مەزهەبییەکان دادەنێت و لە پاردەکە دێتە

خوار. ئێستا گریان قورگی بەردەدا و دەستی کردووە بە گریان.[1]

لەگەڵ ئەوانی دیکە کە هاتبوونە سەردانی شێخ و ئێستا دەبوا بڕۆن، منیش هەستام. شێخ لەبەر ئەوان لە شوێنی خۆی هەستا و دەستی یەکە یەکەیانی گوشی، هەموویان ڕۆیشتن، بەڵام شێخ بە منی گوت: 'ئێوە دانیشن.'

هیچم نەگوت، بە هێمنی لە شوێنی خۆم دانیشتمەوە. شێخ لە بەردەم پەنجەرە دانیشت و لە دەرەوە ڕاما، سەیرم کرد بیر لە شتێک دەکاتەوە. ئەو تەسبیحە زەردەش بە خێرایی لە نێو پەنجەکانیدا دەخولایەوە.

سەیرە، ئەم تەسبیحە لە کوردستاندا چیرۆکی خۆی هەیە. لە گیرفانە گەورەکانی شەلوارە فشەکانی هەموویاندا دەیبینی، لە ڕۆخ شەقامەکاندا هەموو جۆرەکانی دەفرۆشرێن. تەسبیحی دەنک گەورە، تەسبیحی شینی ئاسمانی، فەیرۆزەیی، تەسبیحی لە شێوەی مێزەری پیاوانی نێو چیاکان، پیاوانی چەکدار. تەسبیحی لە ڕەنگی کراسی ژنانی کورد (کە لە کێڵگەکاندا کار دەکەن) زەرد، قاوەیی، نارنجی، پرتەقاڵی، سپی، گوڵگوڵی، کارەبایی، تەسبیحی وا کە بە خێرایی دەخولێنەوە، لە نێودەستان ئاسان دەسووڕێنەوە، بەردەدرێنەوە خوار، بۆ سەرەوە هەڵدەدرێن، دیسان بۆ خوارەوە، لێکدەکرێنەوە و دووبارە خڕ دەکرێنەوە و دەکەونەوە سەر لەپی دەست، تەسبیحانێک کە...

****

---

١-ڕوونکردنەوەیەکی پێویست، بۆ ئەوەی ئەم نووسینەی ئێمە کۆنەپەرستان شاد نەکات: شێخ عیزەدینی حوسێنی پیاوێکە بە تەواوی ماناوە پیاوێکی ئاینی و خزمەتگوزاری ئیسلامە، ئەو بڕوای تایبەتی بە ئەبوزەر و تێکۆشەرانی سەرەتای ئیسلام هەیە، شێخ باوکی ڕۆحی خەڵکێکە کە لە کوردستاندا ستەمیان لێ کراوە. – نووسەر–

## هەرچی کورد بیەوێت منیش دەمەوێت

لە دەرەوەی شاری مهاباد (بەرەو لای میاندواو) لە شوێنێک، لە تەنیشت تەپۆلکەیەکدا چەکفرۆشەکان، بە تەنەکە و جەمەلۆن و بە گەلای درەخت و نایلۆن هەریەکە و دوکانۆچکەیەکیان دروست کردوە و لەوێدا چەک دەفرۆشن. بە تەکسی لە شار دەچمە دەر و سەرێک لەو دوکانۆچکانە دەدەم.

منداڵی دە ساڵە کە هاوقەد و قەوارەی ئەوانە لە تاراندا بنێشت و نانی لەواشەک دەفرۆشن، چەند دەمانچەیەکیان بە دەستەوەیە وەک ئەوەی بڵێن 'لەواشەک دەفرۆشین'، دەڵێن:

'سێ تومەن، سێ تومەن، دەمانچەی ئەڵمانی سێ تومەن.'

لەولاترەوە کوڕێژگەیەک هاواردەکات: 'فیشەکی ژ٣، فیشەکی برنۆ.'

کوڕێژگەیەکی دیکە کە چەند نارنجۆکێکی لەکۆشی کراسەکەی کردبوون و بەنێو کڕیارەکاندا دەگەڕا و هاواری دەکرد 'نارنجۆک، نارنجۆک ١٨٠ تومەن، ١٨٠ تومەن.'

کوڕە گەنجێکی دێهاتی کە دەیویست دەمانچەیەکی ئیتالی بکڕێت، کەوتمە دوای تاکو بزانم چی دەکات. بۆ کڕینی ئەو جۆرە دەمانچە تایبەتە چەند دوکانۆچەیەک گەڕا. قیافەی وەکو کرێکارانی بیناسازی بوو کە ئێواران لە کار دەگەڕێنەوە و لە نانەواخانەیەکدا لەتە نانێک دەکڕن و لەگەڵ بڕێک ئەشقەمە[1]

---

١-ئەشقەمە، ئەو خواردنە هەرزانەیە کە بریتییە لە ریخۆڵە و سییەلاکی

ورگـی خۆیـان تێـر دەکەن و هەر لەوێ لە پەنـا دیـوارەکە خەو دەیانباتەوە. شەلوارێکی ڕەشی فشی لە پێ بوو، پێڵاوەکانی کۆن و دڕاو و کراسـەکەی لە فـۆرمی ئەو کراسـە ڕەنگیـیە دوازدە تومەنیانە بوو. هەموو جەستەی داپۆشیبوو.

ئەوەنـدە گەڕا تـا دەمـانچەی بە دڵـی خـۆی پەیدا کرد. نرخـی دەمـانچەکە دووهەزار و حەوتسـەد تـومەن بـوو. هەرچـی کـردی قاچاخچییەکە یەک قڕان نەهاتە خوار. دواجار، گوتی:

'دووهەزار و حەفتسەد و پەنجا تومەنم هەیە، بەم پارەیە هەم ئەم دەمـانچەیەم دەوێ و هەم بەسـتەیەک فیشـەک و هەم دەمەوێت هەندێک پارەم بۆ بمێنێتەوە کە بتوانم بگەڕێمەوە گونـد و هەمیش بتوانم پاروە نانێک بخۆم.'

پاشان هەمـوو پارەکەی دەرهێنـا و لەبەردەم قاچـاخچییەکەی دانـا. کـابرای قاچـاخچی زۆر بە سـادەیی پرسـی: "گونـدەکەتان لەکوێیە؟" پیاوەکە گوتی: "کۆنەدژ، دەوروبەری میاندواو"

کابرای قاچاخچی بە پەنجە حیسابی کرد، بڕێک پارە، نزیکەی هەشت تومەن و پێنج ڕیال و دەمانچەیەکی مارکەی ئیتالیایی و بەستەیەک فیشەکی دایە دەستی گەنجە دێهاتییەکە و گوتی:

"ئێستا کە ڕاستت پێ گوتم، ئەمە چەکەکەت و ئەمە فیشەک و ئەمەش پارەی کرێ و نانخواردنت."

پیاوە دێهاتیەکە بە خۆشحاڵییەوە لە شـوێنی خـۆی هەسـتا، بە دوایـدا چـووم. بەرەو تەپـۆلکەیەک ڕۆیشـت کە لەوێ هەرکەس چەکـی کڕیبـا، تـاقی دەکـردەوە. لە خـوار تەپـۆلکەکە لە سـەر عەرزەکە دانیشـت. دەسـتی بەسـەری داهێنـا و پرچـی بـۆ دواوە هەڵـدایەوە. هێشـتا منـی نەبینیبـوو. حەوت فیشـەکی دەرهێنـان و خستنیە نێـو مەخزەنـی دەمـانچەکە و بەبـێ ئەوەی پەلاپیـتکەکە

---

ئاژەڵ و ورگە پێست، لە زۆر شار و گەڕەکە هەژارنشینەکان هەبووە.

دابگرێ تاقی کردەوە، حەوت جار دەمانچەکەی ڕاکێشا و حەوت فیشەکی فڕێ دانە دەر، کەوایە دەمانچەکە تەواوە، لەبەرخۆیەوە شتێکی گوت. سەری خۆی هەڵبڕی منی لەتەنیشت خۆیدا بینی. کەمێک ترسا. بە بزەیەکەوە گوتم:

"تەواوە؟"

گوتی: "بەڵێ، تەواوە."

گوتم: "دەمانچەت بۆ چییە؟"

گوتی: "کێشە زۆرە. شەو دادێت بۆ ناموسی مرۆڤ. دەبێ شتێک هەبێت."

تێگەیشتم درۆ دەکات. پرسیم: "وەرزێری؟"

گوتی: "بەڵێ وەرزێرم."

گوتم: "مەگەر دەرامەتت چەندە کە دووهەزار و حەوت سەد تومەن بدەیت و ئەم دەمانچە بێکەڵکە ئیتاڵییە بکڕیت؟"

ئێستا ئیدی دەمانچەکانم دەناسینەوە، پیاوەکە لە جیاتی وەڵام بداتەوە، پرسی: "ئاسایشی؟"

گوتم: "نە، ڕێبوارم."

بە ئاسوودەییەوە دەمانچەکەی خستەوە نێو گیرفانی شەرواڵەکەی. هەستم کرد کە متمانەی پێ کردم، لێی پرسیم:

"خەڵکی تارانی؟"

" بەڵێ."

گوتی منیش هاتومەتە تاران. بۆ عەمەلەیی. هەر کارێک هەبا دەمکرد، ئاوی حەوزم هەڵدەهێنجا، هەر کارێک..." پاشان بە زەوقەوە گوتی: "مەیدانی 'شەهیاد'[1]یش پێدەزانم. ناوەکەیان

---

١-گەورەترین و بەناوبانگترین مەیدانی شاری تارانە کە لە سەردەمی ڕژێمی شا و لە ساڵی ١٩٧٠ دروست کراوە و دوای ڕووخانی ڕژێمی شا ناوەکەی گۆڕدراو کرایە مەیدانی ئازادی.

گۆڕیوه؟"
"بەڵێ گۆڕیویانە"
"ناویان ناوە چی؟"
"مەیدانی ئازادی."
پێکەنی: "پارکی شاریش شارەزام. زۆر لەوێ خەوتووم، ناویان نەگۆڕیوە؟"
"نە. نازانم."
گوتی: "درۆم کرد، ژن و منداڵم نییە، بەخۆم تەنیام، ژنم نییە. پارەم نییە. لەنێو کورددا چل هەزار تومەنت دەبێ هەبێت تا کچێکت بدەنێ."
تەمەنی نزیکەی ٢٧ ساڵ دەبوو، چاوکولی گرتبوو، چاوی سوور هەڵگەڕابوون و پێکداقۆپاو، گلێنەی چاوەکانی ڕەشاییان تێدا نەمابوو. "ئەمساڵ بۆ کار نەهاتمە تاران. کار نەبوو. قەرەباڵغ بوو. پارەم نەبوو، کەسێکم نەبوو. پارچە زەوییێکم هەبوو، فرۆشتم، چەکم کڕی، فرۆشتمەوە. دیسان کڕیمەوە. هەر جارەی پەنجا تومەنێکم قازانج دەکرد. خۆ کارێک نییە تا بیکەین، ناچارین."
پاشان گوتی:
"تاران زۆر باشە، کاری زۆر لێ هەیە. ئەمن دەتوانم هەموو کارێک بکەم. ئاوەڕۆ کردنەوە، فەرش تەکاندن، قوڕکاری، بەڵام لێرە کار نییە. لێرە هەر کەسە و چەکێکی هەڵگرتووە و ئۆتۆنۆمی دەوێت."
"تۆ ئۆتۆنۆمیت ناوێت؟"
شڵەژا: "چۆن نا، منیش ئۆتۆنۆمیم دەوێت."
گوتم: "ئۆتۆنۆمی چییە؟"
"وەڵڵا نازانم."
پێکەنی، منیش پێکەنیم. پاشان پێکەنینەکەی بووە قاقا،

تێنەگەیشتم بۆ! کە پێکەنینەکەی تەواو بوو چاوە دەردەدارەکانی سوورتر هەڵگەڕان و پڕ بوون لە ئاو، ئاماژەی بۆ لای شار کرد و گوتی:

"هەرچی ئەوان بیانەوێت، منیش دەمەوێت."

دەستی بردە گیرفانی. نە، چەکەکە لە شوێنی خۆی بوو، دیسان پێکەنی.

***

## لەگەڵ گەنجەکان سەر لە گوندەکانی دەوروبەر دەدەم

وردەوردە لە مهاباد لەگەڵ کەسانێکی زۆر ئاشنا بووم. زۆربەیان ئەو گەنجانەن کە هەریەکەیان ئەندامی یەکێک لە رێکخراوە پێشکەوتنخوازەکانی کوردستانە. لەگەڵ ئەوانە سەرێک لە گوندەکان دەدەین. ئەوان بەردەوام لە تێکۆشان و هەوڵدان دان، دەزانن کە دەرفەت کەمە. کەوایە دەبێ تا درەنگ دانەهاتووە تا ئەوەندەی دەکرێت خەڵک، بەتایبەتی خەڵکی دێهاتەکان هۆشیار بکرێنەوە، دەبێ یەکێتییەکان بە هێز و تۆکمە بکرێن، کەسانی گومانلێکراو و هەلپەرستیان لێ دووربخرێنەوە. دەبێ قسەیان بۆ بکرێت، بەردەوام پرسەکانیان بۆ روون بکرێنەوە. هەنگاو بندرێت، رێگای خەباتیان نیشان بدرێت، نموونەیان بۆ بێننەوە، بەڵگەیان بخەنە بەر دەست. هەموویان دەزانن خەریکە درەنگ دادێت. هاکا فرۆکەکان لە ئاسمانی کوردستاندا بەدیار کەوتن، بۆیە دەبێ دەستوبرد بکەن.

لە یەکێتییە جووتیارییەکانی دێهاتەکانی دەوروبەری بۆکان و میاندواو چەند کەسێک لە.... خۆیان خزاندۆتە نێو کاروبارەکان و دەسەڵاتیان پەیداکردووە، دەبێ دەستی ئەوان کورت بکرێتەوە و کار و جموجۆڵەکانیان سنووردار بکرێن. کەواتە دەبێ دەستوبرد بکرێت و بەهەر چەشنێک کە پێویست بکات هەنگاو بندرێت. کورەکان دەست بە روونکردنەوە دەکەن.

'ئەو.... لە دێهاتییە حاڵ باشەکانن، لە یەکێتییێکی جووتیاریدا ڕەنگە شوێنی ئەوانیش هەبێ، بەڵام دەبێ هەژارەکانیش ڕابکێشرێنە نێو کارەوە. وەرزێرێکی حاڵ باشی ئازارنەچەشتوو، لەپێ دەستی شەقار شەقار نەبووە، مشەخۆرە، تراکتۆری هەیە، وەک ئەوەی وەرزێرێکی بێ موڵک و زەوی و هەژار ئاغا دەناسێت، ئەو نایناسێت. ئەوان بۆ ..... جاسوسی دەکەن.... حەز بە چارەی ئەندامانی ئەو یەکێتیانە ناکەن، بۆیە دەبێ ئەوانە لە یەکێتییەکان دەربکرێن...'

ئێمە لە گوندی 'حاجی عەلی کەند'ین. ئێوارەیە، پیاوەکان لە کێڵگەکان گەڕاونەتەوە، کۆمەڵێک لە پێش مزگەوت دانیشتوون. هەندێکیان لەبن دیوارەکە ڕاوەستاون و جگەرە دەکێشن. کوڕەکان کە چەند کەسێکیان خەڵکی هەمان گوندن و خەڵکی گوند بە ناو دەیانناسن، لە هەر دەرفەتێک سوود وەردەگرن و قسەکانی خۆیان دەکەن. ئەوان دەیانەوێت بەر لە دەسەڵاتی.... بگرن، دەیانەوێت یەکێتییەکان پەرە پێ بدەن. دەیانەوێت شێوازەکانی تێکۆشانی پێشووتر بۆ دێنشینەکان شی بکەنەوە و پێیان بڵێن: 'بۆ سەرکەوتوو نەبووین، بۆچی لەگەڵ ئەو هەموو پێشمەرگەی هەمان بووە و لە هەموو شوێنێکی دیکە زیاتر قوربانیمان داوە و خەڵکمان لێ کوژراوە کەچی هیچمان بە هیچ نەکردووە، بۆچی لەنێو سیستەمی دەرەبەگایەتیدا پەلەقاژەمانە، لەکاتێکدا هەر لەم دەوروبەرەی خۆمان ئەوانی دیکە لە جیهانێکی دیکەدا دەژین، بۆچی هەر ئێمە لە کوورەخانەکاندا کار بکەین، بۆچی سەرۆکی پۆلیس، سەرۆکی بانک، سەرۆکی دادگا، سەرۆکی شارەوانی، بەڕێوەبەری ناحیە، قایمقامەکانی ئێمە هەر دەبێ تورک و فارس بن. بۆچی ئێمە وا دواکەوتوین و ئاوا بەدبەخت و داماوین کە حەسەنی چەپەڵ بکێشێت بەسەرماندا.

هەمـووی بەهـۆی ئەو مەلایـانە، ئەو دەرەبەگـانە، ئەو... و ئەو حکومەتە چەپەڵانەیە هەمووی لەبەر ئەوەیە کە ئێمە تەنیا چەک هەڵدەگرین و پاکی دەکەینەوە و خۆمـانی پێ بـادەدەین و دەبینە پێشمەرگە، بەڵام نازانین کە دەبێ چی بکەین، بوونە پێشمەرگەی ئـاوا چ سـوودێکی هەیە. بـوون بە پێشـمەرگە و خزمەتـی ئاغـا کـردن چ دەردێـک دەرمـان دەکـات، بـوون بە پێشـمەرگە و پاراسـتنی گیـانی مەلا بەکەڵکـی چـی دێـت، دەبـێ ئەو....، ئـێمە حیزبێکمـان گەرەکە لەگەڵ ئێمەدا بێت، ئەنـدامەکانی کاتێک دێـنە نێو گونـد، نەچـنە مـاڵی ئاغـا، نەچـنە مـاڵی مەلا، بێنە لای ئێمە و بەدوای چارەسەری کێشەکانەوە بێن، لەگەڵ ئێمەی مسکێن قسـە بکەن، حیزبێک کە لەنێو ئاغـا و مەلا و خـاوەن نۆکەر و خـاوەن تراکتۆر و کەمپاین، سنوور دانەنێت بەدەردی ئێمە نـاخوات. ئاغـا لەگەڵ مسـکێن جیـاوازە. دوژمنـی ئـێمە ئاخونـدە، بەردەوام ئەم جـۆرە قسـانە دەکەن، ئـێمە کـوردین، ئـێمە جیـاوازین، ئـێمە خەباتگێڕین، ئێمە ئازار چەشتووین، ئەم قسانە بێسوودن. هەموو مرۆڤەکانی وەکو ئێمە ئەم جۆرە زوڵمەیـان لەسـەرە. هەموویـان دوژمنێکی گەورەیـان هەیە، هەمـوو ئەو مرۆڤـانەی وەکـو ئێمە لە هەموو وڵاتەکانی دیکە دەچەوسـێنەوە و ئاغاکان، دەرەبەگانمـان تێبەردەدەن. ئێمە دەبێ یەکەم جار بیر لە هەموو وڵات بکەینەوە. خوازیـاری مـافی هەمـوو خەڵکـی ئەم وڵاتە بـین و لەتەک مـافی هەموو ئەو خەڵکەدا داکۆکی لە گەلی خۆمـان بکەین. خوازیـاری مـافی هەمـوو خەڵکـی ئەم وڵاتە بـین، ئـێمە نابێـت ئەو مـافە بە خۆمـان بدەین کە ئاغـا و مسـکین و جاش و مەلا لە یەک ڕیز و یەک ئاست دابنێین و بڵێین کە ئـێمەی کـورد هەموومـان بـرای یەکین، کورد ناتوانێ هەموو لە هەمووی برای یەک بن. ئەوانەی ستەمیان لـێ کراوە و ئەوانەی کە ستەمیان کردووە و خەڵکیـان چەوسـاندۆتەوە دوژمـنن. مسـکێنێکی ئازارچەشـتووی «بەلـوچ»

هاودەرد و برای ئێمەیە.'
لاوانی خوێندەواری لادێی ئازارەکانی دێنشینان دەرک دەکەن و دەزانن دەردەکانیان چین. ئەوان ئاغا و مەلا وەک ئەوەی هەیە دەناسن، بۆیە هێڵی سوور لەنێوان ئاغا و مسکێن دەکێشن و خەڵکی گوند لە مەلا ئاگادار دەکەنەوە. ئەوان دەزانن کە ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان کاتێک واتایەکی دەبێ کە حکومەتێکی دیموکراسی و لایەنگری گەل لە وڵاتدا هەبێت، بۆیە هەمیشە جەخت لەو خاڵە دەکەنەوە.
'ئێمە چی لە کوردستانێکی خاوەن ئۆتۆنۆمی بکەین، کاتێک کە وڵات ئازاد نەبێت و سوپا هێشتا لە ژێر دەستی پاشماوەکانی بەکرێگیراوانی شا دابێت . ئێمە یەکەم جار ئێرانێکی ئازادمان دەوێت و لەنێو ئێرانی ئازاددا کوردستانێکی ئۆتۆنۆمیدار. نابێ لەبیری بکەین ئێمە یەکەم جار دەبێ ئێران لە دەست ستەمکاری ئازاد بکەین. ئێمە تاکە کەسانێکین کە شۆڕشەکە بە نیوەچڵ ناهێڵینەوە و درێژەی پێ دەدەین، بەڵام دەبێ لەو چوارچێوە وشکەی کە بۆ خۆمانمان کێشاوە بێینە دەر. لەو نەتەوەییە، نەتەوەییبوون و تەنیا نەتەوەییبوونە بێینەدەر، ئێمە نەتەوەی خۆمان لە بیر ناکەین، بەڵام بۆ پاراستنی نەتەوەکەمان و بەدەستهێنانی کوردستانێکی ئازاد و ئاوەدان پێویستمان بە ئێرانێکی ئازاد و ئاوەدان هەیە. دوژمنی ئێمە تورکەکان نین، فارسەکان نین، دوژمنی ئێمە هێزێکی جیهانییە کە هەموو مرۆڤەکانی وەکو ئێمەی خستۆتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە و بە کرێی گرتوون. دوژمنی ئێمە ئاغا و دەرەبەگەکانن، سەرمایەدارەکانن، سەرمایەدارانی گەورە دەستیان خستۆتە نێو دەستی یەکدی، ئەوانەی کە زەندەقیان لە ئازادیی کەسانی وەکو کورد چووە. دوژمنی بۆگەنی ئێمە سەرمایەدارییە، سەرمایەدارەکان دەیانەوێت کوردستان وا بە دواکەوتوویی

بمێنێتەوە، دەیانەوێت لێرە کەسانی نەخوێندەوار، بێ هەست، بێ زانست بمێننەوە. ئەگەر کوردستان بە دواکەوتوویی بمێنێتەوە و خەڵکەکەی بە نەزانی بمێننەوە، ئەوان دەتوانن سوودمان لێ وەربگرن و بمانچەوسێننەوە و لە ڕێگەی ئێمەوە زەبر لەوانەش بدەن کە داوای ئازادیی خۆیان دەکەن. سوود لە ئێمە وەردەگرن و ئەکێشن بەسەری فەلەستینیەکان، ئەکێشن بەسەری تورکەکان، بەسەری فارسەکان. دەیانەوێت بمان کەنە نۆکەری ئیسرائیل. ڕێگای بازرگانی لەوبەری کوردستانەوە ڕادەکێشن. کارخانە ناهێننە ئێرە، زانکۆ ناکەنەوە، ڕێگا دروست ناکەن، تراکتۆرمان نادەنێ، جەندرمە و پۆلیسمان بۆ دێنن تاکو ئێمە هەر دواکەوتوو و نەخوێندەوار و هیچ نەزان بین و منداڵەکانمان بکەینە پێشمەرگە و ڕەوانەی شەڕیان بکەین. پێشتر بارزانیی بەکرێگیراو، بارزانیی تاوانبار کە واماندەزانی ئازادیمان بۆ دێنێت کەچی ئەو یاخییە ناکەسە ئێمەی فرۆشت. ڕۆژێک بۆ ئیسرائیل کاری کرد و ڕۆژێک بۆ ئامریکا و ڕۆژێک بۆ محەمەدڕەزا شا و ڕۆژێک بۆ کۆماری ئیسلامی و ڕۆژێکیش بۆ کەسێکی دیکە.. ئەمە هەمووی بە هۆی ئەوەوەیە کە ئێمە نەخوێندەوارین، هیچ نەزانین و ناهێڵن ببینە هیچ، لەبەر ئەوەیە کە حیزبی دیموکرات دەیەوێت بۆ ئێمە هەم لەگەڵ ئاغاکان و هەم لەگەڵ مەلاکان و هەم لەگەڵ جاشەکان ئۆتۆنۆمی وەربگرێت، ئێمە ئەو ئۆتۆنۆمییە... ئەو ئاغایە و ئەو...'

ئێمە لە گوندی 'ئەتەمیش'ین. سبەی نوێنەری یەکێتییە جووتیارییەکانی سی گوندی دەوروبەری مهاباد و میاندواو و بۆکان لەم گوندەدا کۆبوونەوەیان هەیە. کوڕەکان لەگەڵ چەند کەس لە نوێنەرەکان کە لە گەڵ خۆیانن و بۆچوونی گەنجەکانیان قبوڵە، قسە دەکەن. سبەی دەبێ قسەی پێویست بە هۆی ئەو نوێنەرانە و بە ئامادەبوونی هەموو نوێنەرەکانی دیکە

بکرێت و تەنانەت ئەگەر پێویست بکات دەبێ زۆر پێداگری لەو قسانە بکرێن.[1]

'دەبێ هەموو لایەک تێ بگات کە سەرمایەدارە گەورەکان بۆ بەرژەوەندیی خۆیان بە مەبەست ئێمە هەروا دواکەوتوو دەهێڵنەوە. جادە و ڕێگاوبانمان بۆ دروست ناکەن، کارخانەیان دروست نەکردووە، ئاغاکانیان کردوونەتە کەڵەگا بە سەرمانەوە. ئەمانە هەموو بۆ ئەوە دەکەن کە ئێمە لەهیچ نەگەین، ئەگەر ئێمە تێ بگەین و ئازادیمان وەدەست بێنین، ئەم ناوچەیەی کوردستان، کوردستانی ئێران، عێراق، سوریە و تورکیە شوێنێکی وایە کە ئەگەر ئازادیی بەدەست هێنا، بەدوایدا و بە نۆرە ولاتانی عێراق، سعودیە، تورکیە، فەڵەستین، ئوردن، پاکستان.. هەموویان یەک بە دوای یەکدا بۆ ئازادیی خۆیان ڕادەپەڕن و دەست بە خەبات دەکەن. ئەگەر کورد بخوێنن و هۆشیار ببنەوە، پێشمەرگەکانیان کەسانی خوێندەوار بن و ڕێگای ڕاست و دروستیان نیشان بدەن و هەموویان لەسەر ڕێگایەکی ڕاست کۆ ببنەوە و ڕەگوڕیشەی مەلا و ئاغا دەربێنن و بە هانای خەڵکی دیکەوە بچن و لەگەڵ کرێکارانی چەوساوەدا دەستی هاوکاری بخەنە نێو دەست و ئێران لە ژێر چەپۆکی دەسەلاتدارانی بۆگەنی بێگانە ڕزگار بکەن، ئیدی دەبینین کە ئازادی وەک شنەی شەماڵ لە ئێرانەوە بۆ هەموو ولاتانی دراوسێ و بۆ ئاسیا و هەر جێگایەکی کە پێویست بکات هەڵدەکات.'

ئەو چەند نوێنەرەی گوندەکان کە ڕێباز و تێڕوانینی گەنجەکانیان قبوڵە و لەگەڵ ئەواندا کار دەکەن، سبەینێ دەبوا لە نێو نوێنەرانی دێهاتەکانی دیکەدا قسە بکەن. ئەو نوێنەرانەی کە

---

١-ئەمە کاک مەستەفایە ئەو قسانە دەکات.- نووسەر-

هەندێکیان بۆ.... جاسووسی دەکەن و بەشێکیان دەردەکەوێت جاشن و لە هەمووی گرنگتر سبەی دەبوا قاچی ئەو مەلایەی کە هەر لە هەوڵی ئەوەدایە کاری یەکێتییەکان تێک بدات و خۆی وەکو هەمیشە هەمەکارە و دەسەڵاتدار بێت، لە نێو یەکێتییەکاندا ببڕن و دووری بخەنەوە، سبەی دەبوایە هەموو شتێکی مەلا بخرێتە ڕوو و ئەوەی بن بەڕەی بخرێتە سەر بەڕە و بۆ هەموو نوێنەرەکان ڕوون بکرێتەوە و پێیان نیشان بدرێت کە مەلا بۆ ئەوە نابێت ببێتە نوێنەری جووتیاران. سەیری دەستی مەلا بکەن ئەوە کەی دەستی کەسێکی زەحمەتکێش و جووتیارە، دەستی دەڵێی دەستی خانمانی شارە. ئەم مەلایە کوا دەتوانێت قسەی دڵی وەرزێرێکی مسکێن بکات. ئەم مەلایە بەردەوام مریشکی خواردووە، لە ژێر سێبەر دانیشتووە و سەرما و گەرمای نەبینیوە، ئەم مەلایە بە کەڵکی هیچ نایە.

سبەی دەبوا بڵێن ئەمە بە مەبەست وا دەکرێت کە ناهێڵن کورد ڕێگاوبانی هەبێت، دکتۆر و دەرمانی هەبێت و بڵێن ئەم دەوڵەتە لەگەڵ ئەو دەوڵەتەی پێشتر جیاواز نییە و ئەم سوپایە هەمان سوپای جارانە. سبەی نوێنەرە گەنجەکان قسەی زۆریان هەیە، بەڵام کێشەکانیش زۆر گەورەن، هێند گەورە وەکو کێو وان. سبەی گەنجەکان و هاورێکانیان ناتوانن سەرکەوتوو بن، چونکە دەیانەوێت مشتومڕ لەگەڵ ئاغاکان، مەلاکان، لەگەڵ سەرمایەدارە بیانییە گەورەکان، لەگەڵ ئیمپریالیزمدا بکەن، کە دەیەوێت هەموو ناوچەی کوردستان بکاتە پێگەی کۆنەپەرستی. دەیانەوێت سبەی مشتومڕ لەگەڵ جاشەکان، هەر ئەو کوردە خۆفرۆشانەی کە بوونەتە چڵکاوخۆری سەر سفرەی ئاغا و مەلا و بەکرێگیراوەکانی دەوڵەت، بکەن و دەستوپەنجەیان لەگەڵدا نەرم بکەن. گەنجەکان بە سبەی و زۆر سبەی دیکە ناتوانن ئاوا زوو شتێک بە شتێک بکەن.

***

## هەفتەنامەیەکی کوردی، بەشێک لە هۆکارەکانی ئەو دواکەوتنەی کوردستانی دیاری کردوون

١-گەشەنەکردنی سەرمایەی پیشەسازیی ناوخۆ بە هۆکارگەلێکی مێژوویی و هەلومەرجی تایبەتی ناوچەکە.

٢-نەبوونی سەرمایەگوزاریی دەرەوە بە هۆی کەمی مادەی خاو و کانزایی... کە بۆ سەرمایەگوزارییە دەرەکییەکانی ئیمپریالیستی پێویستن.

٣-ژیانی خێڵەکی و بەرهەمە ئاژەڵییەکان وەک یەکێک لە بەرهەمە سەرەکییەکانی ناوچەکە. بە شێوەیەک ئەمڕۆ لە کوردستاندا دەکرێ تەنیا ناوی بەشێکی کەمی وەک کوورەخانەی خشتسازی و کارگەی مافوورچنی و شتی لەو بابەتە وەک بەرهەمی جیا لە بەرهەم و بەروبوومی کشتوکاڵی و ئاژەڵداری بێنین...

١-دەسەڵاتی زۆری دەرەبەگەکان کە زۆربەیان ئاغا و سەرۆک هۆزەکانن...

***

## مەزهەبی سوننە لە کوردستاندا شتێکی نەکردووە

لە کوردستان تا زایاتر بمێنیەوە و زیاتر لەگەڵ خەڵکەکەیدا ئاشنا ببیت، دەبینی کە کێشە و گرفتەکان چەند زۆرن و بۆ چارەسەرکردنیان چەند پێویستیت بە دۆزینەوەی ڕێگاچارەی باش هەیە...، چەندت پێویست بە لەخۆبردوویی و فێربوون و هۆشیارکردنەوەی کۆمەڵانی خەڵک و ڕێکخستن هەیە. ناکرێت هێڵێکی دیاریکراو بۆ کوردستان بکێشرێت. لە هەندێک شوێندا ئاغاکان هێشتا دەرباری خۆیان هەیە و نۆکەر و کارەکەریان لە خزمەت دان. لەهەندێک شوێنان ناوچەکە لە ئاغا و دەرەبەگەکان پاک کراوەتەوە، لە هەندێک شوێنی دیکە وردە خاوەن زەوییەکان دەسەڵاتیان هەیە، لە شوێنی دیکەدا دەبینی دێهاتیانی بێ زەوی بەردەوام کار بۆ ئەوانی دیکە دەکەن، لە هەندێک شوێنیش ئاغاکان لەگەڵ حکومەتدا چەکیان هەڵگرتووە و کلکەلەقەی بۆ دەکەن، لە هەندێک شوێنی دیکەشدا ئاغاکان بە زۆری زۆرداری مسکێن و دیهاتییەکان ڕەوانەی شەڕی دژی حکومەت دەکەن. لێرە مەزهەبی سوننە لەو ڕووەوە کە نەیتوانیوە لەگەڵ پرسەکانی ڕۆژدا (بەڵێ بە هەرحاڵ وەکو شیعە) خۆی بگونجێنێت و لەبەر ئەوەی نەیتوانیوە شان بە شانی گەلی خەباتگێڕی کورد هەنگاو بنێت، بەتایبەت لەوەی کە نەیتوانیوە چارەسەرێک بۆ ئەو هەموو ستەمەی لە کورد دەکرێت بدۆزێتەوە، خۆی لە خۆیدا پەراوێز کەوتووە. شیعە

لانیکەم حالەتە کۆمەڵایەتییەکەی خۆی لە زۆر بۆنەی وەک لە دایکبوونی ڕێبەرە دینییەکانیان، مردنیان، ساڵیادەکان و شتی دیکە پاراستووە و هەمیشە سوودی لەو حالەتە کۆمەڵایەتیانە وەرگرتووە و هەر کاتێک بە گونجاوی زانیبێت بۆ وەرگرتنی مافی خۆی دژی ستەمکاران ڕاست بۆتەوە، نموونەش زۆرن وەکو ئەو جووولانەوە بەربڵاوانەی کە لە مزگەوتەکاندا ڕێکخراون و لەوێوە بەرەو شەقامەکان کشاون، بەڵام دەبینین ئەو جۆرە جووڵانەوە و لڤ و تەڤگەرانە لە کوردستاندا ناتوانن دروست ببن (لە ڕۆژانی سەرەتای شۆڕش ئەو کاتەی کە موسڵمانانی شیعە کۆمەڵانی بەربڵاوی خەڵکیان لە مزگەتەکانەوە بۆ شەقامەکان رادەکێشا، دەبینین کە موسڵمانانی سوننە هێشتا نەیانتوانیبوو خۆیان ڕێک بخەن). بەهەرحاڵ کاتێک بە پرسی مەزهەب چارەسەری بەدی نایەت، کەواتە خەڵک دەبێ پەنا ببەنە بەر شتێکی دیکە بۆ بەدەستهێنانی مافەکانیان کە بە هۆیەوە بتوانن خۆیان ڕێک بخەن و دژی ستەمکاران ڕابپەڕن. مێژووی خەبات و تێکۆشانی کوردستان نیشان دەدات کە ئەنگیزەیەکی کارا و کاریگەر لە جێی ئەنگیزەی مەزهەب پیادە دەکەن کە ئەویش ئەنگیزەی نەتەوایەتییە، بەڵام نەتەوایەتیش بە نۆرەی خۆی کێشە و گرفتی زۆر لە ڕێی بە ئەنجامگەیاندنی تێکۆشانی گەلی کورد دێنێتە ئارا. گەنجەکان لەمە تێگەیشتوون و خەریکی چارەسەرکردنی ئەو کێشەیەن، ئەگەرچی لەسەر ڕێ لابردنی، زۆریش سەختە.

***

## دڵم لە مهاباد هەڵناقەنێ و نامەوێ لێرە بڕۆم

لە مهاباد دەچمە دەر و بۆ بینینی گوندە کوردنشینەکانی دیکە کە لە لێواری سنووری ڕۆژئاوای مهابادەوە تا ماکۆ درێژ دەبنەوە، دەچمە ورمێ.

پێم خۆش نییە لە مهاباد بڕۆم، ئەوێ نێوەندی هەواڵ و دەنگوباس و پڕوپاگەندەکانە، ئەگەر بتەوێت بزانیت لە دنیا چ باسە و چی ڕوویداوە، ئەوەندە بەسە لە ماڵ بێیتە دەر و پیاسەیەک بە نێو شاردا بکەیت. لەو ماوەیەی کە لە ماڵ بوویت یان لە شار نەبوویت، ڕێکخراوە سیاسییەکان هەموو ئەو بوویەر و ڕووداوانەی لە سەر ئاستی کوردستان و لە سەر ئاستی ئێران ڕوویانداوە، کۆیان کردوونەتەوە و چاپیان کردوون و ڕێک لە بەر خاتری تۆ چەسپاندوویانن بە دیوارەکانەوە و تۆ بە پیاسەیەک بە شەقامێکی شاردا هەموو شتێکت بۆ ڕوون دەبێتەوە. هەواڵەکانی کوردستان بەر لەوەی بگەنە ڕادیۆ و دەزگاکانی چاپەمەنی لە دیوارەکانی شار دروان و هەڵواسراون و تۆ کە بە ڕێگادا دەڕۆیت بەردەوام خەریکی خوێندنەوە دەبیت. هەر بەڕێوە، کۆمەڵە خەڵکێک لە شوێنێک وەستاون.. ئەرێ ئەمە چ باسە؟ هەواڵێکی تازە:

(خەڵکی قارەمانی مەریوان هەموویان، بەڵێ هەموویان شاریان بەجێهێشتووە و پەنایان بردۆتە بەر کێوەکان. بژی خەڵکی قارەمانی مەریوان.)

زۆری پێناچێت که هەر لەوێ بۆت ڕوون دەبێتەوە کە: (خەڵکی مەریوان بۆیە شارەکەیان چۆڵ کردووە، چونکە نایانەوێت دەستپێشخەر بن لە هەڵگیرسانی شەڕ. مەریوانییەکان و گەلی کورد بە گشتی شەڕخواز نییە. ئێ کاتێک دەوڵەت بەردەوام پیاوەکانی ئەو موفتیزادە بەکرێگیراوە ڕەوانەی ئەوێ دەکات، کاتێک لە تارانەوە بەردەوام پاسدار دەنێرێت، دیارە ئەو دەوڵەتە دەیەوێت ڕەوشێکی وا بێتە ئارا کە لە ڕێی سوپای ئیسلامەوە ڕووبارى خوێن لە مەریوان وەڕێ بخات. ئەو دەوڵەتە پیاوەکانی دەنێرێت بۆ نێو کۆڵانەکانی مەریوان، تاکو منداڵێک، بەڵێ منداڵێک جنێوێک بدات، بەردێکیان تێبگرێت، ئینجا ئەو بەکرێگیراوە زلـلەیەک لە منداڵەکە بدات و پاشان پروشکی ئاگری شەڕێکی ڕاستەقینە لێ بدرێت، ئەو شەڕە نەفرەتیەی...)

(ئەو دەوڵەتە بە دوای بیانووەوەیە. هەر ئەوەندە بەسە مەریوانییێکی چەپ، سەیری پیاوەکانی بکات، دەبینی پروشکی ئاگرەکە هەڵدەستێ و شەڕ دروست دەبێت، ئەو شەڕە ماڵوێرانکەرە...)

(مەریوانی ئیدی شێت و دەهری دەبێت، ناتوانێت بژیت. ماڵی وێران دەبێت. دەستی ژن و منداڵەکانی دەگرێت و دەڵێ بەڕێزینە ئەم شارە بۆ ئێوە، شارمان بۆ چییە، بە قوڕ بگیرێ. ئێستا چڵکاوخۆرەکانی خۆتان بێنن و پڕی کەن. نەفرەت لە...)

دیسان هەواڵ، هەواڵی نوێ..

(خەڵکی قارەمانی کامیاران، زەمانەتی نارنجۆکەکانیان ڕاکێشاوە، ڕەختە و فیشەکدانەکانیان لە خۆ داون و ڕژاونەتە سەر شەقامەکان و بەسەر سوپای بەکرێگیراودا هاوار دەکەن: ئەگەر دەتەوێت بۆ کوشتاری خەڵکی مەریوان بچیت، یەکەم جار دەبێ بەسەر تەرمی ئێمەدا تێبپەڕیت. خەڵکی قارەمانی کامیاران

لە بەردەم تانکەکاندا راکشاون.. فەرماندەی تانکەکان هەراسان دەبێت، دەنەڕێنێت:

(ئێوە میللەتێکی سەیرن، ڕاستیان گوتووە کە کورد کێوی و یاخین. ئێوە بە ڕاستی جوداخوازن. ئەوە نییە خەڵکی موسڵمانی قەزوێن و هەمەدان و کرماشان نوقڵ و شیرینیمان بەسەردا هەڵدەدەن و سڵاواتمان بۆ لێدەدەن و نزامان بۆ دەکەن کە بڕۆین مەریوانییەکان خەڵتانی خوێن بکەین، بەڵام ئێوە خەڵکی کامیاران ئەوە چ بەزمێکە ناوتانەتەوە!)

ئەو ڕۆژەی کە هەموو مەریوانییەکان شار بەجێدێڵن، پارێزگار داماوانە دەڵێت:

'ڕێی تێناچێت، نابێت، هەبێت و نەبێت هێزێک لە پشت پەردەوە دەستتێوەردان دەکات.)

شەوی دواتر تەلەڤزیۆن ڕووی کامیراکە دەکاتە جاشێک (کوردێکی خۆفرۆش) و ئەو جاشە دەڵێت 'ئەمە کاری کۆمۆنیستەکانە و لە دەرەوە پارەیان بۆ دێت.'

سەرۆکوەزیریش لە شوێنێکدا گوتی: 'لە جێگایەک پشتیوانیان لێدەکرێت.' پارێزگار و سەرۆکوەزیر بە هەموو بێسەروبەریی خۆیانەوە، بە باشی دەستنیشانیان کردووە کە هێزێک لە پشتەوە ڕێبەرایەتیی چالاکییەکە دەکات، بەڵام هیچ کات تا ئەوەدەمەی بە دەستی هەمان ئەو هێزە لەنێو دەچن ناتوانن تێبگەن کە ئەو هێزە، هێزی کۆمەڵانی خەڵکە. هێزی گەورەی ستەملێکراوان و ئازارچەشتووەکانە کە یەکیان گرتووە. یەکێتییەکەیان لانی کەم یەکێتییێکی زەحمەتکێشانی گوندەکانی مەریوانە.

دەبێ زیاتر بەنێو شاردا بگەڕێم، هەواڵی دیکەش هەن. یاسای بنەڕەتیان شی کردۆتەوە. ئەگەر تۆ نەتەوێت بزانی کە یاسای بنەڕەتی چییە و حەوسەڵەی ئەوەت نەبێت مادە و بڕگەکانی بخوێنیەوە، هەر ئەوەندە بەسە کە پیاسەیەک بەنێو شاردا

بکەیت، هەر بە خۆت دەبیتە شارەزایەکی یاسای بنەڕەتیی کۆماری ئیسلامی و دەتوانی کە گەڕایتەوە ماڵ بۆ هاوڕێیەکت، ئاشنایەکت، ژنەکەت، منداڵەکەت دانە بە دانە کەموکوڕی و خەوشەکانی یاسای بنەڕەتی باس بکەیت، چونکە ڕێکخراوە سیاسییەکان خەوش و کێماسییەکانی یاسای بنەڕەتیان دۆزیوەتەوە و بە دیوارەکاندا چەسپاندوویانە.

بەردەوام بڵاوکراوە دوای بڵاوکراوە دەگەن. ئەمەیان لە شێخ عیزەدینەوەیە، ئێستا ئیدی دەزانم کە هەموو کوردستان ئەویان دەوێت. لە بڵاوکراوەکەدا نوسراوە:

"سلاو و دروودی من بۆ خەڵکی کامیاران، خەڵکی قارەمان. درودی من بۆ خەڵکی مەریوان، درود..."

بڵاوکراوەتەوە جارێک بە زمانی کوردی و جارێک بە زمانی فارسی نوسراوە، ئەم زمانەی کوردی چ ئاوازێکی خۆش و شیرینی هەیە و هەندێک جار چەند بە هێز و کاریگەرە. بلندگۆیەک لەسەر بانی مزگەوتێک بە زمانی کوردی داوای دەکرد کۆمەکی خەڵکی مەریوان بکرێت. تۆ ئەگەرچی لە واتای وشەکانی نەدەگەیشتی، بەڵام دەتوانی هێز و شکۆ و یەکێتیی گەلێکی تێدا بدۆزیتەوە و لە یەکە یەکەی وشەکاندا کە لە بلندگۆیەکەدا پەخش دەبوون، تۆ درێژەدان بە شۆڕشێک، دەردێک کە گەلێک چەشتوویە و نیگەرانی خەڵک لەو فڕۆکانەی کە بۆی هەیە هەر ئێستا نا ئێستا دەربکەون و گەورەیی و شکۆمەندی و پەیوەندیەک کە گەل لەگەڵ یەکدا هەیەتی دەتوانی ببینی و تۆ ناتوانیت کارێک بکەی جگە لەوەی کە لە شوێنێک ئەو دەنگانە چەند جار گوێ لێبگری و دیسان گوێیان لێبگری و تێبینی ئەوە بکەیت کە چی بەو خەڵکە دەڵێن چۆن دەیانەوێت دەمیان بگرن و پێیان بڵێن: بێدەنگ بن، ئێوە نابێ بە زمانی خۆتان قسەبکەن، تۆ لە بارەی ئازارەوە بە زمانی خۆت هیچ

شتێک مەڵێ. یان بێدەنگ بە یان ئازارەکانت بە زمانێکی خوازراو بڵێ. بە زمانێکی خوازراو باسکردن لە یەکێتیی نێو خەڵک و بانگهێشتیان بۆ برایەتی، باسکردن لە ئێش و ئازار بۆ خەڵکێک کە بە گولله وەڵام دراوەتەوە و داوای خوێنی لێ کراوە، شتێکی چەند گاڵتەجاڕانە دەردەچێت.

تۆ دەبێ هێشتا بەناو شاردا بگەڕێیت. هەواڵی زۆر هەن ئا زۆر زۆر. دەتوانی سەرێکیش لە هۆڵی لەشجوانی جاران بدەیت. لەوێ لاوانی هونەرەجوانەکانی بەشی مۆسیقای شاری سنە هاتوون و دەیانەوێت سەمفۆنیایەکی کوردی، ئاوازێک، شتێکی تایبەتی کورد پێشکەش بکەن. سەرت دادەنەوێنی و بۆ پێشەوە دەڕۆیت و لە تەنیشت هەموو کوردەکانی دیکەدا دادەنیشیت. ژەنیارەکان گروپێکی گەنجی حەڤدە هەژدەساڵەن بە ڤیلۆنەکان، ئۆرگەکان، نەی و دەمبکەکانیان، ئەوەی دەیانەوێت بیژەنن، ئەو ڕووداوانەن کە لەکوردستاندا ڕویانداوە.

'نەورۆزی خوێناوی سنە.'

'هێرشی تانکەکان بۆ نەغەدە.'

'هاواری کورد...'

کورد بۆ ژەنیارەکانی خۆیان چەپڵەیان لێدەدا. بەوپەڕی جۆش و خرۆشەوە. یەکێک لە ژەنیارەکان دێت و لە بارەی کوردستانەوە دەدوێت، لە بارەی چیاکان، لە بارەی کێڵگەکانی گوڵەبەڕۆژە، لە بارەی ڕووبارەکان، دەشتەکان، لە بارەی مۆسیقا و لە بارەی ئازادییەوە، خەڵکەکەش چەپڵە لێ دەدەن.

سەمفۆنیا دەست پێدەکات و تۆ هێشتا تەواو جێگای خۆت نەگرتووە کە مایسترۆکە ئاماژەیەک دەکات و لەچاوتروکانێکدا ژەنیارەکان هۆڵی لەشجوانی دێننە هەژان. لەنێو ئاوازی دڵڕفێنی مۆسیقادا تانکەکان دەنەڕێنن و لە هۆڵەکە نزیک دەبنەوە و هاواری خەڵکەکە لەگەڵ دەنگی زنجیری تانکەکان تێکەڵ دەبێت و

تۆ لەسەر شوێنی خۆت ڕێک دانیشتوویت. سەرگرووپ فەرمانی هێرش دەدات، شێلکەی تفەنگەکان دەنگ دەدەنەوە و خەڵکی کورد و هەموو ئەو کوردانەی لە هۆڵی لەشجوانی دانیشتوون، دەدرێنە بەر ڕێژنەی گوللە. دەنگی تانکەکان نامێنێت، شێلکەکانیش دەنگیان نامێنێت، ئاوازێکی خەمگین لە هۆڵی لەشجوانیدا دەبیسترێت. وەک ئەوەی بڵێی شوانێک بێت لە ئێوارەیەکدا بە دڵی تژی خەفەت و ئازارەوە تێی هەڵکردبێتە شمشاڵەکەی، بەڵام مایسترۆ بوار نادات، بە خێرایی دەستی بەرز دەکاتەوە، چەند ژەنیارێک شتێک دەژەنن کە وەکو شێلکەی کلاشینکۆف دەنگدەداتەوە. چەکەکە بەدەوری خۆیدا خول دەخوات و دوژمن لە پەلوپۆ دەخات، گەل شادمانانە هۆرا دەکێشێت. مایسترۆ فەرمانی پەلامار دەردەکات، کورد دەست دەدەنە چەکەکان و دەنگی شێلکەی بێ پسانەوەی کلاشینکۆفەکان لە هۆڵی لەشجوانیدا دەزرینگێتەوە.

ژەنیارەکان ئارەقەیان لێدەچۆڕێتەوە وەک ئەوەی لە شەڕ گەڕابنەوە.

لە مهابادەوە بەرەو ورمێ بەڕێدەکەوم و لەوێ بۆبینینی دێهاتە کورد نشینەکان دەچمە شاپوور و خویی و ماکۆ. لەو ناوچەیەدا ئاغاکان هێشتا بە هێزەوە حکومڕانی دەکەن.



# جاشەکان

ئەو کــوردە خۆفرۆشــانەش کەم نــین. زۆر بە ئاســوودەیی لەگەڵمدا دەجووڵێنەوە بۆ پەنایەکم دەبەن و بەهێواشی دەچرپێنن بە گوێمدا..

"لە قومەوە هاتوویت؟"

"بەڵی لەقومەوە هاتووم."

"دەگەیتە...؟"

"بەڵی، دەتوانم بگەمە ئەوان."

"سـڵاویان لـێ بـکە، پێیـان بڵـێ ئـێمە گیانفیـدای ئێـوەین، ئـێمە نـۆکەری ئێـوەین، وێنەکـانی ئێوەمـان هەیە، قایممـان کـردوون، ناهێڵن لە دیواری بدەین."

جاشەکان زۆرن. ڕامدەکێشنە پەنـایەک و دەڵێن: "ئەو حیزبی دیمــوکراتە چەکەکــانی لەو پشــت چیــایە لەنێــو ئەشــکەوتێک شـاردۆتەوە. پێیـان بڵـێ بـابێن و دەسـتی بەسـەردا بگـرن. بڵـێ بـا هێرش بێنن ئێمە یارمەتیان دەدەین."

جاشەکان زۆرن.

"خەڵکی تارانی؟"

"بەڵێ خەڵکی تارانم."

"منیشـم تـارانم زۆر خۆشـدەوێت، تارانیەکـان زۆر باشـن. ئەم کــوردانە کێـوین، مــن کێـوی نـیم، ئەمــانە خوێنــدەواریان نیــیە، تارانیەکــان ماشــەڵڵا هەموویــان خوێنــدەوارن. مــن تــارانم زۆر خۆشدەوێت."

دەبێ خۆت لەو جاشانە بپارێزی.

"ئەگەر پەلامار بێنن زۆر باش دەبێت. دەبێ سوپا بێت، خوشکی ئەمانە.... خوا دەوڵەت بپارێزێت، خوا....."

جاشەکان لە کوردستان بەڕاستی بەلایەکی گەورەن.

***

# سەفەرەکە نیوەچڵ دەمێنێتەوە

مانگی مۆرداد[1] خەریکە تەواو دەبێت. سەیری ڕوخساری هەر کوردێک دەکەیت نیگەرانە، نیگەرانی جەنگ. ڕادیۆی دوژمن هاوار دەکات و دەنەڕێنێ: (کورد لە مەترسی دایە، گەمارۆ دراون، یارمەتی کورد بدەن. دەبێت سوپا بچێت و گیانی ئەو کوردانە ئازاد بکات.)

خەڵکەکە مات و سەراسیمە سەیرم دەکەن، نیگاکانیان هاوار تا شتێک لە هاوار زیاترە کە:

"لە کوێ! لە کوێ ئێمە لە مەترسیداین؟!"

فەرمان هاتووە کە نابێت کەس گوێ لە کورد خۆی بگرێت.

تەلەفزیۆن، تەلەفزیۆنی کۆماری ئیسلامی، تەلەڤزیۆنی دژی کورد ڕووی کامێراکەی کردۆتە جاشێک، پاشان دەنگی جاشەکە لە سەرانسەری ئێران و هەموو گوند و شارەکان دەبیسترێت کە دەڵێت:

"بە فریامانەوە وەرن، ئێمە قوممان زۆر خۆشدەوێت. وەرن ئێمە ڕزگار بکەن."

سەرەنجام دەرگای سەربازخانەکان دەکرێنەوە تانکەکان بەرەو کوردستان دەکەونە جووڵە. من پەشۆکاوم. ئێستا کوردەکان دەناسم، کەسێک دەبێت هاواری ئەوان بگەیەنێتە خەڵکی دیکە.

---

[1] -مانگی مۆرداد لە ٢٣ی تەموز دەست پێدەکات تا ٢٢ی ئاب

فرۆکە بۆمب هاوێژە ترسناکەکان لە ئاسمانی کوردستاندا
دەردەکەون، خەریکم شێت دەبم، هاوار، هاوار، هاوار.
من کورد دەناسم ئەوان شەڕیان ناوێت.
من دەزانم کوردەکان شەڕخواز نین.

یارمەتیان بدەن،
فریایان بکەون،
من دەزانم..
فریایان بکەون

ڕوخانی ڕژێمی شای ئێران، کورد و کوردستانی زیندوو کردەوە، بۆ ئەمەش دەوڵەتانی ناوچەکە دەبوو داردەستێکی بەهێزو چەواشەکاریان هەبێت تا بتوانن دیسانەوە ئاشبەتاڵی پێبکەنەوە و لەناوی بەرن. لەبەر ئەم هۆکارەیە کە دەبینین یەکسەر لەدوای دروست بوونی جمهوری ئیسلامی ئەم تاقمە بەهێزکرانەوەو خرانەوە نێو گۆڕەپانی سیاسی ناوچەکەو وەك داشە هارەی دامە خرانەوە نێو گەمەی سیاسی و لە دژی گەلی کورد لە هەر چوار پارچەی کوردستان خرانەوە گەڕ. گرمەی خەبات و شۆڕش ئەوێ ڕۆژی لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان بوو، بۆیە قیادە مۆقەتە وەك مۆتەکە بەردرایە گیانی شۆڕشی کوردەکانی ئێران. ئەم ئەرکەش بۆ قیادە زۆر ئاسان بوو، چونکە ئەوان پێشتر ئەم کارەیان زۆر بە جوانی بۆ ساواکی ئێران ئەنجام دابوو

